



ناوی کتێب : سەلیم و خەندە

تاوەبارانێك فرمێسك

نووسەر : خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ : تارا محەمەد

داڕشتنەوەی : بەهرە محمدعلی

نۆبەی چاپ : سێهەم - ٢٠١٤

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (٢٠٠٤)ی ساڵی ٢٠١١ ی پێ دراوە

# پێشەکی نووسەر

خۆشەویستانم.. شەیدایانی دۆزینەوەی ڕاستەقینە، هەریەك لە کتێبەکانی (محەمەدی دوزجەیی) و (ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت) و (ئایسێڵ)تان خوێندەوە. لەکاتی خوێندنەوەیاندا زریانێکی بەهێزی پەندو پەرۆشی هەڵیگرتن. لەوانەشە هەندێکتان لەکاتی خوێندنەوەیاندا فرمێسکی چاوەکانتان بۆ ڕانەگیرابێت. ئەوەش لەمیانەی ئەو هەست و سۆزەی کە لەو نامەو ئیمەیڵ و تەلەفۆنە بێشومارانەی پێم دەگات، هەستی پێ دەکرێت.

(سەلیم)یش یەکێکە لەو بەرهەمانەی کە چاوەکانتان نوقمی فرمێسك دەکات. (سەلیم)یش چەندین دیمەنی پڕ پەندو بەهاتان نیشان دەدات... و لە چیرۆکی (سەلیم) دا چەندین پەیامی گرنگ بۆ مرۆڤایەتی بەدی دەکەن.

چیرۆکی (سەلیم) بریتییە لە بیرەوەرییەك کە ڕووی داوە. ئەم کتێبە چیرۆکی ژیانێکە کە مرۆڤ نوقمی سەرسامی دەکات و دەیداتە دەم گەردەلوولی پەرۆشی و لەو نێوەندەشدا چەندین وانەی گرنگمان فێردەکات.

کاتێك ئەم چیرۆکە پڕ پەندو ئازارو مەینەتییەم دەخستە سەر کاغەز، دەستم لە ناوەڕۆك و هەیکەل و پوختەی بەسەرهاتەکە نەداوە، تەنها کەمێك ڕێکمخستەوە و بەشێوازی خۆم دامڕشتەوە، بۆئەوەی بەرجەستەترو پڕماناتر بە خوێنەرەکانمان بگات.

لەم چیرۆك و بەسەرهاتی ژیانەدا دایکان، باوکان، کچان و کوڕانی لاو خۆیان دەبیننەوەو ڕاست و هەڵەکان دەبینن و، هەست بەوە دەکەن کە پێویستە سەرلەنوێ چاوێك بە خۆیاندا بخشێننەوە.

هیوادارین هەموو کەسێ ئەم کتێبە کە پێویستییەکی ناخی هەمووومانە بخوێنێتەوە.

* بۆ ئەوانەی دەتوانن فرمێسکەکانیان ڕابگرن...

* بۆ ئەوانەی دەتوانن زاڵ ببن بەسەر هەستە جوانەکانیاندا...

* و بۆ ئەوانەی بەرگە دەگرن...

فەرموون... زۆر سوودمەند دەبن.

خالید ئێرتوغروڵ

# بەشی یەکەم

## شتی وا نەبیستراوە

### پوختەی ئەم بەشە:

لە منداڵییەوە تـا ئێستا چیرۆکی وام نەبیستووە.

هـیچ چـیرۆکێك هێنـدە کـاری تێنـەکردووم و، هـیچ بەسەرهاتێك هێندە نەیگریاندووم.

ئـەم ڕووداوە پـڕ پەنـدو سەرسـامکەرە، موچـڕکە بـە لەشی مرۆڤدا دەهێنێت.

## شتی وا نەبیستراوە ..

ژوورەکـەم، پـڕ بـوو بـوو لـە خوێنـەری بەرهەمـەکانم، گفتوگۆیـەکی خۆشمان دەست پێکردبوو، بـە پرسـیارو وەڵامـی جۆراوجۆر. یـەکێك لـە پرسیارەکانیان دەربارەی نوێترین بەرهەمم بوو، منیش باسی ئـەم کتێبـەم بۆ کردن کە ڕەشنووسەکەیم تەواو کردبوو. هەندێك لە بەسەرهاتەکانی نـاو کتێبەکـەم بـۆ بـاس کـردن، بـەهۆی کاریگـەریی ئـەو بەسـەرهاتانەی دەمگێڕانـەوە، بێدەنگییـەکی زۆر بـاڵی بەسـەر ژوورەکـەدا کێشـا بـوو. لەبەرئـەوەی ئـەو بەسـەرهات و ڕووداوانـە ئەوەنـدە کاریگـەربوون زوو زوو چاوەکانمان تەڕ دەبوون، هەندێ جاریش هەیەجان و پەرۆشـی دەگەیشـتە لوتکە.

یەکێك لە خوێنەرەکانم خۆی پێڕانەگیراو، قسەکانمی بڕی و وتی:

– یەك دەقە مامۆستا،

دەستی خستە سەر سنگی و وتی:

– لەوانەیە نەتوانم خۆم ڕابگرم، تکایە با پشوویەك بدەین.

بەم پچڕانە لە پـڕە، کەشـە ئەفسـووناوییەکەی ژوورەکـە تێك شـکا. هـەموومان بـە خۆمانـدا هاتینـەوە، وەکـو لـە خـەوێکی قـووڵ خەبـەرمان ببێتەوە، هەر ئەو خوێنەرەم وتی:

– ئەمانـە چـەند ڕووداوی سـەیر سـەیرن، ئەمانـە نـە بیسـتراون و نەبینراون، ئایا هەموو ئەم ڕووداوانە ڕاستن؟!

لەو کاتەدا کە خۆم ئامادە دەکـرد بۆ وەڵام دانـەوەی؛ لـەپڕ زەنگـی تەلەفۆنەکەم لێیدا.

کێ بوو ئەو کەسەی لەو کاتەدا تەلەفونی کرد؟! پاڵەوانی ئەو ڕووداوانە بوو، کە باسم دەکردن. لە بەرامبەر ئەو قەدەرە سەیرەدا بە سەرسامییەوە وتم:

– باشە، ئەوەش گەورەترین وەڵام بۆ ئێوە، لەبەرئەوەی قارەمانی ئەو ڕووداوانەی باسم کردن، ئێستا لەسەر هێڵەو چاوەڕێی وەڵامە. خوێنەرانی ناو ژوورەکەم لەپڕ ڕوانینەکانیان گۆڕا. سەرنجە پڕ سەرسامی و پەرۆشییەکانیان لەیەك ئاڵا بوو. یەکێك لەخوێنەرەکانم یەکسەر هەستا و وتی:

– خودایە تۆ چەندە بە دەسەڵات و پلان دانەری، لەبەردەم حاڵەتێکی ئاوادا مرۆڤ خۆی پێدەگیرێت؟!

سەلیمی خۆشەویست بە چەند وشەیەکیش بێت هاتە ناو گفتوگۆکەمانەوە، بەکورتی هەستەکانی لەگەڵ ئێمەدا بەش کرد.

سەلیم تازە لە سەرەتای (٣٠)ساڵیدایەو، گەنجێکی خوێن گەرم و ژیرە، هەموویان پێیان سەیر بوو، ئەو بەسەرهاتانەی باسم دەکردن خاوەنەکەیان هێشتا لە ژیاندایە.

شتی ئاوا نابێت، ئەمە نەبیستراوەو، نەبینراوە، خاوەنی ئەم چیرۆکە هێشتاش لە ژیاندایە؟!

لەڕاستیدا ئەم چیرۆکە دڵ تەزێنە، ئەم چیرۆکە ناخ هەژێنەرەم لە زمانی خودی سەلیمەوە وەرگرتووەو خۆم هەندێ ڕێکم خستووەو پێشکەشی دەکەم بەو دڵانەی بەرگەی دەگرن.

فەرموون...

## بەسەرهاتی خۆی دەگێڕایەوەو دەشگریا...

ئەو ژیانەی سەلیم دەیگێڕایەوە، جۆرێکە، کە تا ئێستا نە بیستراوەو نە نووسراوە. بەڕاستی ئەمە بیرەوەرییەکە هەموو وشەیەك و هەموو ڕستەیەکی لەگەڵ ئازاردا شێلراوەو گوێگرتن و گێڕانەوەشی ئەستەمە.

هێڵە قوڵەکانی سەر ڕووخساری، ڕوانینە بێ نەواکانی زۆر شتیان دەگێڕایەوە، هەرچەندە هێشتا لە بەهاری ژیانیشیدایە... بەتەواوی وەك کەسێك کە لە نانەواخانەدا کاربکات، بەڵام برسی بێت، کەسێك لە دەریادا مەلە بکات و بەتینوویی بمێنێتەوە، کەسێك کە لە بەهاری ژیانیدا بێت، بەڵام هەستی پیرێتی بکات.

جا سەلیم چی لە دەست نەدابوو؟!! ئەو شتانەی کە لەکیسی چووبوون پەیامێکیان دەیانگەیاند، هێندە پڕ واتا و پەند بوون بەزمانی حاڵ دەیگوت:

- مامۆستا... بە سەرهاتی ژیانی من هەموو گەنجێك دەبێ بیخوێنێتەوە.. دەبێ بیخوێنێتەوە، تا سەرئەنجامی هەڵەکانی من ببینن، تا ئەوان هەڵەکانی من دووبارە نەکەنەوە.

ژیانێك ڕەش بووبوو. پێش ئەوەی دەست پێبکا تەواو بوو بوو، پێش ئەوەی تیای بژی لێی ون بوو بوو.. لەساتێکدا دەیویست بیگرێ، وەك چۆلەکەیەك لە دەستی هەڵفڕی بوو. ئەمە ئاسان نییە.

سەلیم گەنجێکی زۆر هەستیارو دڵ ناسك بوو.. ناسۆری زۆری چەشتبوو. . هەر لەبەرئەوە کاتێ چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕایەوە، هەم خۆی دەگریا، هەم ئەوانی تری دەگریاند. ئەوە گریانێك نەبوو کە تەنیا فرمێسك لە چاوەکان بێنێت، بەڵکو هەموو وجودی پێکەوە دەگریا... ئەم

هـاواره پەرێشـانی دەکـردی، لـە ناخـەوە دەیخـواردی. هـەر بۆیـە لەگـەڵ نووسـینی هـەر وشـەیەك و، هـەر دێڕێکـدا منـیش بەرگـەم نـەدەگرت و فرمێسکم دەڕشت.

## دەزانیت داڕووخان و کەوتن چییە؟

سەلیم بەم جۆرە دەستی بە قسەکانی کرد.

– مامۆستا، دەزانیت کەوتن چییە؟!

باسـی کـەوتنێك ناکـەم وەك کـەوتنێك کاتێـك لـە ڕێگایـەك پێـت هەڵدەکەوێت، یان کەوتنە خـوارەوە لـە دیـوارێکی بـەرزەوە.... نـا.. مـن باسـی ڕووخانێـك دەکـەم لـە دەوڵەمەندییـەوە بـۆ هـەژاری.. لـە خـۆش بەختییەوە بۆ بێ چارەیی.. لە ژیانێکەوە کە هـەموو کـەس خۆزگـەی پـێ دەخواست بۆ پەرێشانی و نەگبەتی.

ئەم ڕووخانە بارێکی ئەوەندە ترسناکە ئەوەندە ئەستەمە، کە تـەنها ئەوانە لێی تێدەگەن کە بەسەریاندا هاتووە.

دەتوانیت بیر لە ماڵی خۆت بکەیتەوە ئەگـەر حسابی بانکییەکـەت و هەموو دارو نەدارت با بیبات و بێیتە سـەر سـفرو پـاش ماوەیـەك بکەویتـە حاڵێـك، بچیتە بـەر دەرگـای مـاڵان و دەسـت پـان بکەیتـەوە..! لـەوەش خراپتر.. لە کەسانێکەوە کە ڕۆژانێك باوەڕت پێیان هـەبووە سـوکایەتی و بێ وەفایی ببینیت... کەس دەرگات نەکاتەوە، کەس لە حاڵت نەپرسێ و، ڕۆژانـە شـتی وات بەسـەر بێـت، کـە ئێسـتا بـە بـاس کردنیشـی مـرۆڤ بسوتێنێت.

پێم وایە ئەو کاتە تێدەگەن ئەم کەوتنە چۆن کەوتنێك بووە.

ئەها دەڵێن: "خوای گەورە ڕۆژی ڕەش نیشانی کەس نەدات" ... جاران من ئەم وتەیەم بە بای خەیاڵدا نەدەهات. ئێستا تێدەگەم بەهای ماڵە ڕووخاوێك و دەستێ جلی شڕو پارچەیەك نانی ڕەق و سەربەرزی و ڕابردوو چەندەو، ئازاری ئاوات خواستن پێی چەند بەسوێیە، تومەس ئەمانەن دەوڵەمەندی ڕاستەقینە.

دەیگێڕمەوە مامۆستا.. هەمووی دەگێڕمەوە.. دەزانم ئێوەش وەك من بەرگەی ئەم چیرۆکە ناگرن و دەگرین و دڵتان دەسووتێ. دەسووتێ چونکە کاتێ بەسەرهاتەکانم دەگێڕمەوە ئاگاتان لەخۆتان نامێنێ.



# بەشی دووەم

## ئاخ.. باوکە.. ئاخ

### پوختەی ئەم بەشە:

هەر کەس سەیری ئێمەی دەکرد ئیرەیی پێ دەبردین، لە چاوی هەموو کەسێکەوە خێزانێکی پێگەیشتوو بووین. بە تەواوەتی لە بەهەشتی دنیادا دەژیاین.

ئاخ.. باوکە.. ئاخ.. تۆ چیت نەگۆڕی؟!

## زۆردڵخۆش و خاوەن دارایی بووین ..

خێزانێکی بە ڕواڵەت بەختەوەر و ناوداربووین، زۆر کەس ئیرەیی پـێ دەبردین و دەیان وت:

- خۆزگەمان بەم خێزانە. زۆر دڵخۆش بووین.. ژیانمان باش بوو.

دایکم وەکو فریشتە وابوو کەسێك نەمابوو یارمەتی نەدابێت، هەژارێك نـەبوو، دراوسـێیەك نـەبوو، ناسـیاوێك نـەبوو دایکـم دەسـتی نـەگرتبێت. دەستی زۆر کراوە بوو، بۆ ناخۆشی کەسانی تـر زۆر دەگریـا، هـەموو کـات لەگەڵ هەژاران بوو. پێویستییەکانی دابین دەکردن. ئەگەر لە دەورووبەریـدا هەژارێك نەبووایە، جانتایەك پێداویستی کۆدەکردەوەو بـەهانای هـەژارانی دوورەوە دەچوو. هەموو ڕۆژێکی هەینی خێری تایبەتی هەبوو، بڕوای بەوە هەبوو کە بەخشین زۆر بەڵات لێ دووردەخاتەوە. هەموو کـات ئێمەشـی بـۆ کاری باش هان دەدا، دایکم هەموو هەفتەیەك دەچووە سەر قەبری دایـك و باوکی و نزای خێری بۆ دەکردن.

یەکێکی تر لە کـردەوە جوانـەکانی ئـەوە بـوو، هەمیشـە سـەردانی نەخۆشی دەکـردو یارمـەتی دەدان. کـاتێکیش دەگەڕایـەوە مـاڵ بـۆ لـەش ساغی و نیعمەتەکانی سوپاس و ستایشی خوای دەکردو دوعاو نوێـژی زۆر دەکرد.

خۆی ناوی (فەریدە) بوو، بەڵام کەسانی دەورووبـەرمان پێیـان دەوت (فریشتە خان) بەڕاستی فریشتەیەك بـوو بـۆ خـۆی. وەك فریشـتە پـاك و، میهرەبان و، خاوەن نیەت و کردەوەی باش بوو، بە ڕاستی خانمێك بوو لـە هەر ماڵێکدا بوایە خۆشی تێدەخست و، ئاوەدانی دەکردەوە.

بەڵام باوکم.. ئاخ باوکم.. بە پێچەوانەی دایکمەوە، کابرایەکی دەوڵەمەندی خراپ و بێ هەست بوو.

چەند ڕێستۆرانێکمان هەبوو. باوکم زۆر مەیی دەخواردەوە، کەس نەیدەزانی خەریکی چییە. هەرگیز نە بەخەم ئێمەوە بوو، نە بەخەم خۆیەوە. هەمیشە لەگەڵ کاری خراپ و کەسانی خراپدا خۆی ڕێك خستبوو.

دایکم لەبەرئەوەی کەسێکی باش بوو، حەزی لە چاکەکاری بوو، دەیویست ئێمەش وابین، لەبەرئەوە لە زۆرێك لە کردەوەکانی باوکم ئاگاداری نەدەکردین. هیچ نەبێ بەهۆی کردەوە وەستایانەکانی دایکمەوە لە ماڵەوە ئەم کارانەی باوکم ڕەنگی نەدەدایەوە، بەڵام قسەو قسەلۆکەکانی دەرەوەمان دەبیستەوە.

بەو پێیەی من بیستبووم باوکم گروپێکی مەیخۆری هەبوو کە لەسەر پارەی ئەم بەڕێوە دەچوو. ئیدی لەگەڵ ئەم گروپانە بۆ هەرشوێنێکی پیس و نەشیاو بیویستایە دەچوو. لەبەردەم ئەم دۆخەدا هەموو شەوێك کە باوکم دەهاتەوە دایکم دەینارده گەرماو تا پاك دەبووەوە پاشان دەیهێشت بخەوێت. ئێمەش واتە من و خوشکەکەم لەبەرئەوەی خۆمان بە منداڵی خێزانێکی دەوڵەمەند دەزانی بە خۆشی ڕامان دەبوارد.

من لەو ساڵانەدا لە پۆلی چواری سەرەتایی بووم، خوشکەکەشم لە یەکی ناوەندی بوو. ئێمە لەبەرئەوەی منداڵ بووین زیاتر لە ژێر چاودێری دایکماندا بووین، بەڵام لەبیرمە من زۆر هار بووم.. خوشکەکەشم کەسێك بوو کە دەیویست زوو لە ژیان تێبگات، حەزی دەکرد هەموو شتێك بزانێت. لەبەرئەوە زوو زوو دایکمان بێزار دەکرد. بەڵام هەرگیز لێمان توڕە

نەدەبوو، هەموو کاتێك بانگی دەکردینە لای خۆی و پێی دەوتین کە ئەمە هەڵەیە، تێی دەگەیاندین لەو کارە دوورکەوینەوە. هەموو کات لەگەڵ ئەوەی بەڵێنمان بە دایکم دەدا، بەڵام دیسان دەستمان پێ دەکردەوە.

## باوکم بەتەواوی ئالودەی کاری خراپ بووبوو:

مەی و کارە خراپەکانی تر هەموو ڕۆژێك زیاتر باوکمیان بەرەو خراپیو پەرێشانی دەبرد. بە جۆرێك کە هۆگریان بووبوو. باوکم لەگەڵ ئەو کەسە خراپانەدا تێکەڵ بوو بوو کە ئەوان خۆیان بە نزیك و دۆستی باوکم پیشان دەدا. باوکیشم هەموو کات دەیوت ئەمانە نزیکەکانی منن، ئەمانە دۆستی منن، بەداخەوە ڕووخساری ڕاستەقینەی ئەوانی نەدەبینی. ئەوان بە ئامانجی دەرهێنانی پارە لە چنگی باوکم، چییان نەدەکرد؟! چییان بەسەر باوکم نەهێنا؟! بەڵام باوکم وەك بێ هۆشێك کە خۆی دابووە دەست ئەوان و بە نزیکی خۆی دەزانین، هەرچییان بوتایە باوکم جێبەجێی دەکرد. هەموو ڕۆژێك بەناوی دۆستایەتیی ساختەوە، فێڵیان لێ دەکردو ئەو ئافرەتانەی کە بەناوی دۆستایەتییەوە لە دەوری کۆدەبوونەوە و کاسەکانی خۆیان لە کاسەکەی باوکم پڕ دەکرد. باوکیشم لە مەبەستی ئەوان بێ ئاگا بوو.

چیتر دایکم نەیدەتوانی نهێنیی ڕووداوەکان لە ئێمە بشارێتەوە... ڕیستۆرانەکانمان دوانیان داخران، یەکێکی تریشیان لە داخستندا بوو.. لە خانەدانی و دەوڵەمەندییەوە وردە وردە خەریك بوو لە دەرگای داڕووخان نزیك دەبووینەوە.

شەوێکیان خوشکەکەم بانگی کردم.. وتی:

– سەلیم.. هەستە.. بزانین دایکم و باوکم لەسەر چی شەڕ دەکەن؟! گوێ بگرە.

دایکم بە باوکمی دەوت:

– وا مەکە تکایە.. شەرمەزار دەبین.. کەسێکی وەك تۆ ناسراو چۆن دەبێت ئاوای لێ بێت؟! منداڵەکان بە هەموو شتێکیان زانیوە ئەوان خوێندنیان هەیە، داهاتوویان هەیە، ئاخر تۆ دەبیتە نموونەیەکی خراپ بۆ ئەوان.. تەنها یەك ریستۆرانتمان بەدەستەوە ماوە. چی بکەین ئەگەر ئەویشمان لە دەست بچێت؟! بۆچی لە بیری ئێمەدا نیت؟؟

باوکیشم کە گوێی بە هیچ نەدەدا و جگە لە ئارەزووەکانی هیچی بۆ گرنگ نەبوو.. گوێم لێ بوو دەیوت: خانم کێ لە برسا مردووە!! ئەگەر ئەویشمان لە دەست ڕۆشت با بڕوات. چی بکەم! دەی وازم لێ بێنە لە برسا نامرین.

– چۆن وازبهێنم، چۆن بێ دەنگ ببم!

مەی خواردنەوەکەت لەلایەك، ئافرەتەکانت لە لایەك، ئەو هەموو گوناهانەی ئەنجامی ئەدەیت لە لایەك، ئیفلاس و زەرەرەکانمان لە لایەکی تر... چۆن دەڵێی گوێی پێ مەدە! چۆن بیر لەمانە ناکەیتەوە!! وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت بەردەوامیت لەسەر ئەم کارانەت! دایکم هێشتاش بێ ئەوەی خۆی عاجز بکات، بێ ئەوەی هەست بەرزی خۆی تێك بدات تکای لە باوکم دەکرد:

– هاوسەرەکەم، تکایەکم لێت هەیە! وەرە با لەم کاتەی شەودا دەست نوێژێك بگرین و بچینە بەر دیوانی خوا، داوای یارمەتی لێ بکەین... خودا ئەو دەستانە ناگەڕێنێتەوە کە شوکرو سوپاسی دەکەن. هەرگیز ئەو دڵانە

ناشـكێنێت كـه داوای لێ دەكـەن، لـه نیـوەی زەرەردا گەڕانـەوەش هەیـە، وەرە با بگەڕێینەوە منیش یارمەتیت دەدەم.. وەرە خوای گەورەو منـیش خۆشحاڵ بكـەو خـۆت و منداڵەكانیشـمان لـەم بارودۆخـە ڕزگـار بكـە. ئـەم داواكارییەم ڕەت مەكەرەوە.

باوكم بێ گرنگی دانە هیچ شتێك:

– بخـەوە خـانم بخـەوە.. كـەس لـە برسـا نامرێـت، سـەمونێكم دەسـت دەكەوێت بۆتانی بهێنمەوە.. مەترسە.

ئەو دایكە فیداكارو میهرەبانەم لە كۆتاییدا پێشنیارێكی تـری هـەبوو كە هەركاتێك دێتەوە یادم ناخم دەلەرزێ، سەرسام دەبم، دەیوت:

– هاوسەرەكەم، مادام ئێمەش ڕادەكێشیتە ئەم پەرێشانییەوە، ئەمەش بۆت گرنگ نییەو بێزارت ناكات.. وەرە كارێك بكـەین. ئێـواران بگـەڕێرەوە ماڵ، من خۆم سفرەت بۆ ئامادە دەكەم و ناپرسم بـۆ دەخۆیتـەوە ! تـەنیا شەوان تێكەڵ بەو كارە پیسانە مەبە، ئێواران وەرەوە لەبەر چاوی خۆمان بە.

باوكم قاقایەكی پێكەنینی لێداو وتی:

– بەڕاستی تۆ فریشتەی، بـەڵام نـەڵێی چـی لەگـەڵ كەسـێكی وەك مـن هاوسەرگیریت كردووە ! ! خۆت ماندوو مەكە، من لە ژیانی خۆم ڕازیـم، زۆر سەر مەكەرە سەرم، جارجارێك دەگەڕامەوە ماڵ ئیتر ئەوەش نابینن.

بەڵام دایكم دیسان بەو سەبرو ئارامییە زۆرەیەوە:

– وازت لەو ئافرەتە هێنا؟

باوكیشم زۆر بە ئاساییی:

– كامەیان؟

- ڕووسییەکە.

باوکم دیسان قاقایەکی لێدا:

- ئەوان دەمێکە ڕۆشتوون"یۆنانی، بولگاری، ڕووسی" ئەمانە نەمان، خانم، ئێستا تورك هەیە، ئەمانە ئیتر ناڕۆن. خانم، ئیشەکان جدیین.

دایکیشم بە خۆڕاگرییەکی زۆرەوە:

- مادام ئێستا تورك هەیەو نیەتیشت جدییە، وەرە ژیانێك دروست بکە، هاوسەرێکی تر بێنە، تەنها لەو جێگە پیسانە دووربکەوەرەوە، تەنانەت ڕازیم کۆنترۆڵی ماڵ بدەمە دەستی ئەو، تەنها بەسیکە تێکەڵاوی ئەو کارە پیسانە، من تەنها ترسم ئەمەیە ئەو جێگانە لە ناوت ببەن.

ڕۆژەکانمان لەگەڵ ئەم جۆرە کێشانەدا تێ دەپەڕی. خۆش بەختیی خێزانە بەختەوەرو دەوڵەمەندەکەمان خەریك بوو لەناودەچوو. دایکم فریشتەی فریشتەکان بە تەواوی هەموو هەوڵی خۆی دەدا، لە لایەك بۆ ئەوەی بە هەر جۆرێك بووە یارمەتی باوکم بدات و ڕزگاری بکات، لە لایەکی تریش وەك ئەوەی هەموو شتێك لە جێی خۆیەتی و هیچ نەبووە دڵی ئێمەی دەدایەوەو ئارامی دەکردین. بەڵام کارەکان بەرەو خراپی دەڕۆشتن، هەر چرکەیەك چاوەڕێی بەڵایەك بووین، پێشهاتەکان هەواڵی باشیان نەدەدا..

# بەشی سێیەم

## خوشکەکەشم ڕێگەی چەوتی هەڵبژارد

### پوختەی ئەم بەشە:

وەك ئـــەوەی هەڵـــەکانی بـــاوکم بەرامبـــەر خێزانەکـــەمان بـــەس نـــەبووبێت، خوشکەکەشـــم دەستی پێ کردبوو. تەنها هاوڕێی گیانی بە گیانیم، خوشکەکەم، وردە وردە بەرەو ڕێگایـەکی بنبەسـت دەڕۆیشت.

## له خوشكەكەشمدا هەڵسوكەوتی نائاسایی بەدی دەكرا:

لەو ڕۆژانەدا من لەقۆناغی دووی ناوەندی بووم، خوشكەكەشم لەئامادەیی بوو. دایكم هەوڵی زۆری دەدا بۆ ئەوەی خوشكەكەم بە ڕەوشت و پەروەردەكردنێكی جوان پەروەردە بكات، بەڵام خوشكەكەم نوقمی چەندان ئارەزوو داواكاری تایبەت بەخۆی بووبوو. بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگ و خۆشبەختی وای لیٚ هاتبوو وەك باوكم كەسی بۆ گرنگ نەبوو. هەروەها ئەو ئاسودەیی و خۆشبەختیەی كە بەناو لە دەوڵەمەندییەوە دەستی كەوتبوو و، ئەو جوانیەی كە هەیبوو وای لیٚ كردبوو كە ئیتر گویٚ بۆ قسەو ئامۆژگاریەكانی دایكم نەگرێت.

دایكم كە هەرگیز دڵشكانی كەسی نەدەویست، خەریك بوو لەگەڵ خوشكەكەم یەكیان زویر دەكرد. كاتێك خوشكەكەمی بەناڕێك و پێكی و لەگەڵ كوڕان دەبینی ئیتر بەرگەی نەدەگرت، كاتیٚ دەگەڕاینەوە دەبووە شەڕیان. ئەوەندە تەلەفۆن دەكرا بۆماڵەوە كە ئیتر تەواو وەڕس و بێزار بووین. لە كۆتاییدا خوشكەكەم بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجەی كە زۆر مەبەستی بوو، لەپێشبڕكێیەكی تایبەتی جوانیدا بەشداری كرد، لەڕێگەی دەزگایەكەوە كە كەس ناوی نەبیستبوو، هەرگیز پێشبڕكێیان ڕێك نەخستبوو. سەرەتا كچەكانیان دەبردە گەشتوگەڕان، دواتر ماوەی مانگێك ڕاهێنان دەكەن و پاشان پێشبڕكێكە ڕێكدەخرێت و، سەركەوتووەكان چەندین دەرگای دەوڵەمەندی و ناوبانگ چاوەڕوانیان دەكات. ئەمە بۆ خوشكەكەم خەونێكی شیرین بوو. من و دایكم بۆ ڕێگەگرتن لە خوشكم چیمان نەكرد؟! تێكچوونی ژیانی ئەویش خەریك بوو دەیترساندین.

باوکیشم کە لە دنیای خۆیدا، زیاتر و زیاتر لەگەڵ کارە نابەجێکانی تێکەڵ و بەردەوام دەبوو. هیچ ئاگای لە هەواڵەکانی ناوماڵ نەبوو، هیچ نەیدەزانی چی دەگوزەرێ. زیاتر لەوەش لەڕۆژەکانی دوایدا نەشدەگەڕایەوە ماڵ. ئاه دایکە ئاه... تۆ چ ژنێکی ئارامگربوویت! لەلایەك باوکم، لەلایەك خوشکم... تۆش بەهەموو تواناتەوە بەرەنگار دەبوویتەوە و، بۆ بەردەوامی خوێندنەکەی من وەك هیچ نەبووبێ خۆی پیشان دەدا، ئەمە چ ئیرادەیەکی بەهێز بوو؟ ئێستا من لەمە تێدەگەم!!

## تەواو ترسابووین

خوشکەکەم کە بۆ بەشداری لەو پێشبڕکێیە لەماڵ ڕۆشتە دەر ئیتر نەگەڕایەوە، زۆر گەڕاین بۆ ئەو بەناو دامەزراوەیەی کە ئەو پێشبڕکێیەی ڕێکخستبوو، بەڵام دامەزراوەیەکی وا نەبوو. ئەو ژمارە تەلەفۆنەش کە بۆی جێ هێشتبووین کاتێ پەیوەندیمان پێوە دەکرد وەڵامی نەبوو!! مۆبایلی تایبەتی خۆیشی داخرا بوو. زۆر ترسابووین، زۆر بەمەراق بووین... دە ڕۆژ، بەتەواوی بەرامبەر تەمەنێك بوو... ئەو دە ڕۆژەی ئومێد و هیواکانی لەناو بردین، ورەی ڕووخاندین، سەدەیەك نائارامی پێ چەشتین.

یەکەمین هەواڵ لە نەخۆشخانەوە هات، کاتێ چووین زانیمان کە خوشکم هەوڵی خۆکوشتنی داوە، هێزو توانای تەواو لێ بڕابوو، بەدەرمانی ئارامی بەخش لەژیاندا مابوو. ماوەی سێ ڕۆژ لەنێوان مردن و ژیان شەڕی دەکرد، من و دایکم ئەو سێ ڕۆژە هێندەی تەمەنمان ڕەنج و ئازارمان کێشا، باوکیشم هیچ گوێی بەئێمە نەدەدا ئەویش بەجۆرێك سەری کەوتبووە کێشەو نارەحەتی قورسەوە، بەڵام ئێمە ئاگادار نەبووین.

خوشکەکەم کاتێ هۆشی هاتەوە بەخۆیدا و ئێمەی بینی، هەرگیز ناتوانم باسی ئەو چرکە ساتەتان بۆ بکەم، کە چۆن کەوتە هاوارکردن:

– بمکوژن، نامەوێ بژیم، چی دەبێ بمکوژن، با نەژیم.

خەریك بووین لەو بارە قورس و گرانە، لەو بەڵاو پەرێشانیەی بەسەر خوشکم هاتبوو تێدەگەیشتین، ئەوان بەناوی پێشبڕکێی جوانیەوە کچەکانیان وەك کاڵایەك بۆ کڕین و فرۆشتن بردووە، ئەو دۆڕابوو کەوتبووە دەست کەسانێکی نزمتر لە ئاژەڵ، دایکم هەوڵی بێدەنگکردنی خوشکمی دا، بەڵام ئەو بەردەوام بوو:

– دەستم لێ مەدەن، من پیس و گوناهبار و عەیبدارم دەستم لێ مەدەن، من دەبێ بمرم، من ئیتر ناژیم. بەم جۆرە هاواری دەکرد و لەخۆی دەدا. پزیشك و پەرستارەکان تێیان گەیاندین کەچی بەسەر خوشکم هاتووە. دایکێکی ئارامگر، ئەو دایکە خۆڕاگرەم لەبەرامبەر ئەم هەموو بەڵاو ناڕەحەتیە هێزی لێ بڕابوو، هەستم دەکرد بەزۆر خۆی ڕاگرتووە، لەنیگاکانیەوە تێدەگەیشتی کە چەندە ماندوو پەرێشانە.

## ژیانی منیش داڕووخا:

دونیای منیش ڕووخابوو، ئەقڵم هیچی وەرنەدەگرت، لەو کاتەدا چیم نەدەکرد؟ ئاھ ئەگەر ئەو کەسانەم بناسیایە کە وایان لەخوشکم کردووە... چیم لێ نەدەکردن؟! مامەڵەکردن بەکچانەوە، وێران کردنی ژیانیان، داڕووخانی ژیانیان، تێکدەری هەموو ئومێدو هیواکان، ئەگەر ئەو کەسانەم دەناسی چیم لێ نەدەکردن!! . هەر لە سەرەتای ژیانمەوە گەورەترین بەڵاکانی ژیانم بینی. باوکم لەدنیای خۆیدا تەواو تیاچووبوو، خوشکەکەشم لە شیرینترین کاتی ژیانیدا ڕووخێنراوە، دایکە

ئارامگرەکەشم کەوتوەتە بارێك کە خۆی پێ ڕانەگیرێ و بێ چارە ماوەتەوە.. ئەوەی کە تەنها ماوە منم.

ئەی هاوار خودایە... دەبێ ڕێگا چارەیەك هەبێت، دەستی ڕەحمەتت بۆمان درێژ بکە... لەم گۆماوی بەڵایانەدا ڕزگارمان بکە.

سەختیەکانی ژیانمان زۆر زوو دەستیان پێ کرد بوو. بەڵام ڕۆژگارێکی وا چاوەڕێی دەکردین، ئەمانە هیچ نەبوون لە چاویاندا!

خوشکەکەم لەژێر چاودێری و چارەسەری دەروونیدا بوو، بەردەوام لەنەخۆشخانە بوو، بەڵام ئومێدی چاك بوونەوەی نەبوو. ئەو ئیتر توانای نەبوو جارێکی تر ژیانێکی تر دەست پێ بکاتەوە...

دایکم شەوانە تا بەیانی فرمێسکی دەڕشت، داوای لە خوا دەکرد بۆ گەڕانەوەی ئۆمێدێك، بۆ گەڕانەوەی خوشکم بۆ ژیان. بەیانیش کە دەهات دەڕۆیشتە لای خوشکەکەم.

## هەواڵی بەڵایەکی تر

لە کاتێکدا ئازار و ناڕەحەتی خوشکەکەم خەریك بوو ناخی دەسووتاندین، هەواڵی بەڵایەکی تر لە دەرگای داین. هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە... ڕۆژێکی هەینی بوو، دایکم خۆی ئامادەکرد بچێتە سەردانی خوشکم لە نەخۆشخانە. زەنگی دەرگاکەمان لێ درا، من دەرگام کردەوە، چاوم کەوت بە چەند کەسێکی نەناسراو، یەکێك لەو کەسانەی نەماندەناسین کە دوایی زانیمان پارێزەر بوو... هاتە پێش و وتی:

– هاتووین دەست بەسەر ماڵەکەتاندا بگرین، باوکت قەرزەکانی نەداوەتەوە، ئێمە کەلوپەلی ماڵەکەتان دەنووسین ئەگەر باوکت لەماوەی دوو ڕۆژدا قەرزەکانی نەداتەوە، ئەوا کەلوپەلەکان دەبەین. دایکم دیسان

شۆكی هەواڵێكی دڵتەزێنی تر بیهێزی كرد. یەكسەر چووم پەیوەندیم كرد بە ژمارەی باوكمەوە، بەڵام ئەوەی وەڵامی دایەوە غەریبەیەك بوو.

— ناتناسم كوڕی بچووك، ئێرە هی ئێوە نییە، دوو ڕۆژ پێش ئێستا ئێرەمان وەرگرت.

— باشە، باوكم لەكوێ یە؟

— ئێمەش بۆ ئەو دەگەڕێین، ئەمانەتەكانمانی نەهێناوە، ئەگەر دۆزیتەوە پێی بڵێ كە ئێمەش پەیوەندیمان پێوە كردووە.

ئەی خوایە گیان، من چی دەبیستم؟! ئێستا دەبێت چی بكەم! ناڕەحەتیەكان یەك لەدوای یەك. دایكم بەهۆش خۆی هاتەوە، پیاوەكانیش كەلوپەلەكانیان نووسیو ڕۆیشتن، دایكم دەستی منی گرتو وتی:

— كوڕم ئارام بە...تەنها ئێمە نین كە ناڕەحەتیمان بەسەر دێت، بەدڵشكان و عاجزبوونمان كارێك ناكەین، هیچ شتێك بەمە چارەسەر نابێت، ئێمە دەبێت پێكەوە بەرگە بگرین و بەرەنگار بینەوە. لەگەڵ داوای یارمەتی و مەدەد لەخوای گەورە. مەترسە كوڕم.. سەرەنجامی هەموومان مردنە. مردن جۆرێكی ترە لەژیان دوای ئەم ژیانە. ئەو خودایەی ئێمەی هێنایەبوون دەشمان باتەوە، ئەو بە ناخۆشیەكان تاقیمان دەكاتەوە، بەڵام بە تەنها جێمان ناهێڵێت، بەدڵنیاییەوە ڕێگەیەكمان پیشان دەدات. با بە بیروهۆشێكی ئارامەوە ئەم ڕووداوانە چارەسەر بكەین. دەبێت توانای بەرگەگرتن بەخۆمان بدەین. لەلایەك بۆ دۆزینەوەی باوكم و، لەلایەكی دیكە بۆ ئەو خوشكەم كە ویستبووی خۆی بكوژێت و تائێستاش نیەتی باش بوونی نیە هەوڵمان دەدا.

باوكم وەك هەڵم چووبوو بە ئاسماندا، هەموو ئەو شوێنانەی دەمانزانی گەڕاین، بەڵام نەبوو، تەنیا دوو ئەگەر بە ئەقڵماندا دەهات.. یان لەبەر قەرزەكانی ڕۆشتووە و خۆی ون كردوە. یان لەناو ئەو كارە پیسانەدا و لەبەر ئەو كێشەو قەرزانەی ئەویش بڕیاری خۆكوشتنی داوە. زۆری پێنەچوو ئەو ماڵەی كە هەمووان پێی سەرسام بوون كەلوپەلەكانی براو ئیتر ئەویشمان لەدەست دا. هەموو دارایی ژیانمان بوو بوو بەسفر. چەند دینارێك لە گیرفانی من و هەرئەوەندەش لەجانتاكەی دایكمدابوو. كە بۆ چەند ڕۆژێك دەیتوانی تێرمان بكات.



# بەشی چوارەم

## هەموو داراییمان لەدەستداو
## بێ ماڵ و حاڵ کەوتین

### پوختەی ئەم بەشە:

ئێمەیێك کە هەر کەس سەیری دەکردین دەمی دەکرایەوە و دەیوت: "ئاخ، خۆزگە ئێمەش ئاوهابووینایە!"... ئێستا بە تەنها لەناو کۆڵان داین، یەك بەندەی خودا نییە بێت دەستێکمان بۆ درێژ بکات. وەك بڵێی ئازارەکان زنجیرەیان بۆ گرتووین.

## دایك و كوڕ دەگریاین

دانیشتم دەستم كرد بەگریان، بۆ یەكەمجار دایكم بەلاوازی بینی باوەشی پێداكردم و هەردووكمان لەبەرامبەر ئەو هەموو ناڕەحەتیەدا دەگریاین، كەس لێمان نزیك نەدەبوەوە وەك ئەوەی لێمان بترسن. هەموو ئەوەی هەمان بوو تەنیا ئەوە بوو كە لەبەرماندا بوو.. بۆ كوێ بڕۆیشتینایە!!

هەستاین... دایكم وتی: كوڕم بابڕۆین.. خوا دەرگایەك دەكاتەوە هەموو كات چاوەڕێی ڕەحمەتی ئەو بە، ئەو هەرگیز پەرێشانمان ناكات، من باوەڕم وایە ئەو یارمەتیمان دەدات. لەگەڵ دایكم ڕۆیشتین.. لەدوای خۆمان ماڵێكمان جێ هێشت، ماڵێك كە هەمووان حەسوودی و خۆزگەیان پێ دەخواست، بە حەسرەتەوە ماڵێك، تەمەنێك، ژیانێكمان جێ هێشت. دەڕۆیشتین... بەڵام بۆ كوێ؟ بێ ئامانج، بێ كەس، برسی و بێ توانا... بەجۆرێك كە پێویستمان بە دڵنەوایی بوو...

– دایكە بۆ كوێ دەچین؟

– بۆ لای خوشكەكەت كوڕم، بۆ لای خوشكەكەت، نابێ بەتەنها جێی بهێڵین. ئەو لە ڕۆژگارێكی زۆر سەختدایە، نەكەی ئەوەی بەسەرماندا هاتووە بە خوشكەكەتی بڵێی. بەجۆرێك مامەڵە بكە وەك ئەوەی هەموو شتێك لەجێی خۆیەتی.

سەرم بۆ لەقاند، بەواتای بەچاوان.

هەموو شتێك لەجێی خۆی بوو!!!! سەرەڕای ئەو ناڕەحەتیانەمان كە بەخەیاڵیش بیركردنەوە لێیان قورس بوو، كەچی دایكم نەیدەویست تەسلیمی ئەو سەختیانە ببێت.

## بەتەواوی لەبێ چارەییدا بووین

هەرگیز بیرم ناچێت، ئەو ڕۆژە کە خانوەکەمان لێ سەندرا، کە بەزۆر لەماڵ دەرکراین. لەبەرئەوەی نەمان دەویست بڕۆین و ماڵەکە چۆڵ بکەین، یەکێك لە پیاوەکان قۆڵی گرتم و کێشامی بەدیوارەکەدا، قولّم شکا چەند ڕۆژ بەئازاری ئەو قۆڵەم مامەوە. زۆر بەتەنهایی مابووینەوە، کەسێك نەبوو یارمەتیەکی لەدەست ببێتەوە، هەموو دۆست و نزیکەکان، هاوڕێ و دراوسێکان ون بوون و نەمان. لەکوێن هەموو ئەوانەی ڕۆژگارێك دایکم بۆ هاوکاریان ڕای دەکرد؟! لەکوێن ئەو بێ وەفایانە؟! خۆم و دایکمم کە بەو حاڵەوە بینی، سەرم گەرم بوو هۆشم لای خۆم نەما... دوای ئەوەم بیرنایەت. کە بەهۆش هاتمەوە لەناوەڕاستی کۆڵان تەنهای تەنهابووین، دایکم وتی:

– هیچ نییە کوڕم... هەستە بابڕۆین خوا گەورەیە ئەمانەش دەبێ... ئەمە ژیانە ژیان.

## ئازاری خوشکەکەم منیشی پەرێشان کردبوو

کە گەیشتینە نەخۆشخانە هەواڵێکی ترمان بیست، خوشکەکەم دیسان هەوڵی خۆکوشتنی داوە. کاتێك ویستویەتی لە پەنجەرەی نەخۆشخانەوە خۆی بخاتە خوارەوە، پەرستارەکان فریای کەوتوون. وەك پزیشکەکان دەیانوت ئەوان کارێکیان لەدەست نەدەهات تەنها ئەوەی دەیان توانی بیکەن ئەوە بوو کەمێ هێزی باوەڕبەخۆبوونی پێ ببەخشنەوە تا ماوەیەکی زۆر لەژێر چاودێری دەروونیدا بێت. بەڵام چۆن؟ بە چ ئیمکانێکی ئێمە؟ بەکامە پارە؟ کێ دێتە یارمەتی و هاوکاریمان؟!

کاتیَ ئێوارە دابهاتایە ماڵێکمان نەبوو بۆی بگەڕێینەوە، کە دەهاتینە لای خوشکەکەم شتێکمان نەبوو بۆی بهێنین. لەگەڵ دایکم چووینە ژووری خوشکەکەم، بۆ یەکەمجار زۆر بە وردی تەماشای کردین، دیسان وتی: بمکوژن.. بمکوژن.. شەرم دەکەم، بێزارم لەم ژیانە، پیسم، زیادەم، شیاوی ژیان نیم.. گەر دەتانەویَ ڕزگارم بکەن بمکوژن. خوشکەکەم ئازارێکی وا دەیسوتاند، گازی لە لێوەکانی خۆی دەگرت، گەر ڕێگەمان بدایە دەمێك بوو کۆتایی بەخۆی هێنابوو ئومێدی ژیان لەڕووخساریدا نەدەبینرا. ویستم لێی نزیك ببمەوە وتی:

– لێم نزیك مەبەرەوە، من نەخۆشێکی ترسناکم، بچمە هەر جێیەك پیسی دەکەم، نامەویَ تۆش پیس بکەم، تۆ بەپاکی بمێنەرەوە، تەنها تۆ بەپاکی بمێنەرەوە.. من شەرم دەکەم.. شەرم دەکەم ڕزگارم بکەن بمکوژن. کیَ بەرگەی ئەم هاوارە ناخ سوتێنانە دەگرێت، چ برایەك دەتوانیَ گویَ بۆ ئەم وشانەی خوشکەکەی بگرێت؟!! ئەم ئازارانە هەم باس کردنیان، هەم ژیان تیایاندا باوەڕ پیَ نەکراوە. ئەو باوەشانەی دایکم و خوشکەکەم، گریان و هاوارەکانیان نەدەتوانم لەبیریان بکەم نەدەتوانم بیانگێڕمەوە.

دایکێك کە هەموو ئومێدی ژیانی گەیاندنی منداڵەکانیەتی بە ئایندەیەکی باش، لەگەڵ ناسینی خوا و ڕەوشت و پەروەردەیەکی بەرز.

کچێك کە ژیانی لەدەست چووەو، گەنجێتی فەوتاوە، لەگەڵ ئەو هەڵەو گوناهانەی ئەنجامی داوە دەسووتێت و، دەڕەنجێت، بیر لەکوڕێکیش بکەنەوە کە هێشتا تەمەنی لە نێوان ١٦–١٨ ساڵیدایە بیَ ئەزموون و، تەنهایە. هیچیشی لە دەست نایەت، تەنها بە فرمێسکەکانی

حەسرەت و ئازارەکانی هەڵدەڕژێت. پەرستارەکان هاتن و بەزۆر دایکم و خوشکەکەمیان لەیەك جیاکردەوە. خوشکم لەحاڵێکدا بوو کە نەیدەزانی چی دەڵێت تەنیا تێدەگەشتم لەعنەت و نەفرەت بۆ ئەوانە دەنێرێت کە ئەوەیان بەسەر هێناوە و، پەیامی بەئازارو پڕ پەند بۆ کچانی دڵساف و ساویلکە دەنێرێت. دایکیشم بێ هێز و ڕووخاو لەبارێکی قورسدا بوو، لە ژوورەکە هاتەدەر و لەپەنایەکدا خۆی دا بەزەویدا. بۆ یەکەمجار لە ڕووخساریدا هەستم بە بێ توانایی و بێ ئومێدیەکی تەواو دەکرد، ئەمە کۆتایی و ڕووخانی دەردەخست. ئەمە مانای ئەوەی دەدا کە ئیتر توانا و ئومێدی ژیان نەماوە. لە تەنیشتییەوە دانیشتم، بەجۆرێك لە چاوەکانی دەمڕوانی وەك ئەوەی بڵێم:

– دایکە ئیتر چی بکەین؟ چیمان لەدەست دێت؟!

دایکیشم ماندوو بێچارە سەری بەرزکردەوە بەرەو ئاسمان:

– خودایە... بەفریامان بگە... یارەبی بەرگە ناگرین، ئەم ڕۆژانە زۆر سەختن...

## لە نائومێدییەکی زۆرماندا ئومێدێك دەرکەوت...

لەناخمدا بایەك لە نائومێدی و –أستغفرالله– ناشوکری خەریك بوو هەڵی دەکرد. چونکە زۆر زۆر ماندوو بوو بووم، زۆر دڵتەنگ بووم هیچیشم پێ نەدەکرا، دەموت بۆ دەبێ هەموو ناڕەحەتی و نەگبەتیەکان لەسەر شانی من و دایکم بێ!! بۆ دەبێ ئێمە باجی هەڵەکانی باوکم و خوشکەکەم بدەین! ئەی خودا بۆ ناگاتە فریامان دوای ئەو هەموو پاڕانەوەیەمان!!!

بۆ یەکەمین جار خەریك بوو وەك خوشکەکەم بیری خۆکوشتن دەهاتە مێشکمەوە... باوەڕم نەدەکرد، بەرگەم نەدەگرت لەگەڵ ئەو هەموو بەڵاو ناڕەحەتیە کەچی دەستێك نیە یارمەتیمان بدات.

کاتێك لەناو ئەم بیرکردنەوە تاڵانەمدا ڕامابووم، بیروخەیاڵم پەرتەوازەبوو... هەستم کرد دەستێك دای لە شانم ئاوڕم دایەوە، خاتوونێکی نزیك پەنجاوپێنج ساڵان بوو.

– تۆ سەلیم نیت!؟!... کوڕەکەی فریشتەخانی خۆمان!

لەگەڵ ئەوەی دایکم بەرامبەرمان بوو، بەڵام ئەو خانمە هەستی پێ نەکرد.

وتم:

– بەڵێ.. من کوڕەکەی فەریدەخانم.

– ئێمە پێمان دەوت فریشتەخان.

کاتێ بەدەست ئاماژەم بۆ دایکم کرد، کە دایکمی بینی:

– ئای.. ئێوەش لێرەن!؟ ئێوەم نەبینی، زۆر دڵخۆش بووم بەبینینەوەتان.

دایکیشم بەزۆر توانای دایە خۆی و هەستایە سەر پێ.

– سوپاست دەکەم بەتول خان، منیش خۆشحاڵ بووم بەبینینتان.

بەتول خان دوای ئەوەی هەستی بەخراپی و نائاسایی حاڵمان کرد:

– هیچ نییە إن شاء الله..!! بۆچی شتێکی خراپ بووە؟! حاڵتان لە خراپ دەچێت!

کە بینی فرمێسکەکان لەچاوی دایکم دێنە خوار:

– ئێوە هیچ باش نین، چی بووە تێم گەیەنن!! فریشتەخان چیتان بۆ پێش هاتووە؟

دایکم دەیویست خۆی لادا لەباس کردنی ئەو هەموو ناڕەحەتییە، بەڵام پێداگری بەتول خانم وای لێ کرد بۆی باس بکات، بەتول خانیش لەگەڵ فرمێسکەکانی چاوی گوێی بۆ دایکم دەگرت کاتێك بۆی دەگێڕایەوە؛ کە چیمان بەسەرهاتووە. دوای ئەوە وتی:

– من ئێستا دێمەوە، تکایە هەر لێرە بمێننەوە.

وتم:

– دایکە .. ئەم خانمە کێ بوو؟ دایکم خەیاڵێکی قووڵ بردیەوە، دوای تۆزێك زەردەخەنەیەکی ئازاراوی لەدەم و چاویدا دەرکەوت، وەك ئەوەی هەست بە پەیدابوونی ئومێدێك بکات، هاتە وەڵام:

– چەند ساڵ پێش ئێستا، ئەم خانمە ناسراوی خوشکەکەم بوو، پاشان بەهۆی کەسێکەوە هاتە لای من و زانیم کە هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کردووەو بەتەنها لەگەڵ کچێکی دەژی، گەر خوا قبووڵی بکات ماوەی چوار، پێنج ساڵ یارمەتی خۆی و خوێندنی کچەکەیم دا بەپێی توانای ئەو ڕۆژەمان.

خوای گەورە لە ناڕەحەترین کاتەکاندا بەندەکانی لەبیرە. هەستم بە دەرکەوتنی هیوایەك دەکرد، ڕووناکیەك لەناخمدا دەدرەوشایەوە.

– کورم وەك دەڵێن: (لەگەڵ خوادابە، چەندە جوان لەگەڵت دەبێت..!!) هەر دەبێت خوای گەورە پلانێکی بۆ هاتنە دەرەوەمان لەم بارە سەختە هەبێ.

ئای دایکی پاك و سەرڕاستم.. لە خراپترین باری ژیانیدا بێت یان لە لەسەرەمەرگیشدا بێت هێشتا ئومێدەکانی ون ناکات!! هێشتا تۆ ئەوانەی دەوروبەرت ئومێدەوار دەکەیت؟ من دەڵێم گەورەترین شانسم لەژیانمدا ئەوەیە کە تۆ دایکمی و، گەورەترین بێ شانسیم ئەو باوکەیە کە هەمە. ئای دایکە.. تۆ بەو هەموو باشیەتەوە، شایەنی باشترین هاوسەر بوویت، بەڵام باوکم هاوسەرتە بەو هەموو چەوتیانەوە. ئەمانە پرسیاری زۆریان بۆ دروست دەکردم... دەزانم کە خوایەك هەیە هەموو بوون و نەبوون لەدەستی ئەوە.. بەڵام ئەی ئەم هەموو زوڵم و ناخۆشیانە بۆچی!!؟ بۆ بەم جۆرە دەژین!؟ دەبێ لێرە ڕێگەیەکی دەرچوون هەبێت...



# بەشی پێنجەم

## ڕووناکییەك دەرکەوت

### پوختەی ئەم بەشە:

لەو ساتەی کە لەناخی خۆمدا دەمـوت: "هـەموو شـتێك تـەواو بـووە، هـەموو شـتێك کۆتـایی هـاتووە." دەمــوت: "ئـیتر دەبێــت خــۆم بکــوژم" لــەم کاتــەدا ڕووناکیەك دەرکەوت... ڕووناکیەکی مانابـەخش و، پـڕ پەند...

## ڕووناکییەك دەبینرێت

زۆری پێنەچوو بەتول خان گەڕایەوە و دەستی دایکمی گرت و وتی:

- دەی با بڕۆین.
- دایکم پێی وت: بۆ کوێ؟
- ئێستا کاتی قسە کردن نییە، لەڕێگا دەزانیت بۆ کوێ دەڕۆین.

لەخوارەوە کچەکەم چاوەڕێمانە، ئەو کچەم کە خۆتان خەرجی خوێندنەکەیتان کێشا، ئەو ئێستا پزیشکە لەم نەخۆشخانەیە، دەی با بڕۆین زۆر شت هەیە بیلێین.....

چارەیەکی ترمان نەبوو،ماڵێکمان نەبوو بۆی بچین، کەسێکمان نەبوو بڕوامان پێی هەبێ. بەتول خان دەستی دایکمی گرت، منیش توانام دایە بەر خۆم و هەستام، تاکو بەدوای ئەواندا بڕۆم.

بەڵێ... دایکم باش هەست پێ کردبوو، وابزانم ڕووناکی ئومێدێك دەرکەوت، ئەگەر بچووکیش بێ لانی کەم ماڵێك هەیە کە ئەمشەو بۆی دەچین، بێگومان ئەگەر ئەو ئاگرەی باوکم و خوشکەکەم لە ناخماندا دایان گیرساند بهێڵێت پشوو بدەین. ڕۆشتینە خوارەوە لە ئوتومبێلێکی مۆدێل بەرزدا خانمێکی گەنجی داپۆشراو چاوەڕێی دەکردین، کە ئێمەی بینی ڕای کردو هات دەستی دایکمی ماچ کرد.

- فریشتە خان، زۆر خۆشحاڵم بە دووبارە بینینەوەتان.

خانمی پزیشك لەم سەرسوڕمانی یەکتر بینینەوەیەدا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:

- زۆر دلگرانم بەوەی کە لەبارێکی خراپدان، ئێوە چاکەی زۆرتان بەسەر منەوە هەیە، هەم بوونە هۆکاری تەواوکردنی خوێندنم، هەم بەهۆی

ئێوەوەیە کە من خاوەنی ئەم ئیمان و باوەڕەم. لە ئێستاوە مـن بـە کچـی خۆتـان بـزانن، دڵنیابـە فـەرمانێك نـابێ کـە ئێـوە پێمـی بڵـێن و ئـەنجامی نەدەم.

هەرکەس لەبارێکی ئاوادا بژی، هەستەکانی پێ ڕاناگیرێ‌و چاوەکان شێدار دەبن. بەهۆی باشیەکانی دایکمەوە بوو کە ئەم شتە باشانە دەهاتە ڕێمان، وتەیـەکی مامۆسـتای ئایینمـان زوو زوو بیردەهاتـەوە کـە دەیـوت: "چـاکە بکـەو بیخـەرە دەریـاوە، گـەر ماسـیەکانیش پێـی نـەزانن، پەروەردگارت لێی ئاگادارە). ئەم ڕستەیە چەندە ڕاستە.

ئەی خوای گەورە..

بـەڵام ئـەو ڕاسـتیەی کـە نـاخمی هەژانـدبوو، ئـەوەبوو کـاتێ بـیرم دەکردەوە لەدایکم.. کەسێك بەخەم ئیمان و ژیانی خەڵکەوە بوو، کەسێك کە هەموو کات یارمەتی کەسانی تری دەدا، کچەکەی خـۆی بگاتـە بـارێکی سەختی ژیان کە بڕیاری خۆکوشتن بدات! !

ئـەی خـوای گـەورە.. ئەمـە چ جـۆرە تاقیکردنەوەیـەك بـوو... نەمدەتوانی تێبگەم. لەخێزانێکی دەوڵەمەندو خۆشحاڵەوە هاتبووینە باری کەسـانێکی بـێ چـارەو هـەژار، باوەڕمـان نـەدەکرد ئێسـتا لـە کەسـانێك یارمەتی وەردەگرین. بەڵام ئەمە تا کەی بەردەوام دەبێت؟!

سواری ئوتومبێلەکە بووین.

ئەو ئوتومبێلە کە دیاری دەستگیرانی خانمی پزیشـك بـوو، کـە پێـی بەخشی بـوو. دەسـتگیرانەکەی کـوڕێکی دەوڵەمەنـد بـوو، کـە بـەو زووانـە دەچوونە ژیانی هاوسەریەوە، ئەوان ئێمەیان دەبردەوە بۆ ئـەو ماڵـەی کـە بۆ دایکی خانمی پزیشـکی کـڕی بـوو. زۆر سـەخت بـوو بـۆم کـە دەمبینـی

خێزانێك لە هەژاریەوە ئێستا لەژیانێکی بەرزدان و، خێزانێکیش لەوپەڕی دەوڵەمەندییەوە ئێستا بێ دەرەتانن، چەند ڕاستە کە دەڵێن: " گرنگ نییە چی بووم.. ئەوە گرنگە چی ئەبم.." دەبم بەچی؟ تەمەنم چۆن تەواو دەبێت؟ دۆستی ڕاستەقینە کێیە؟ دەوڵەمەندی ڕاستەقینە لەچیدایە؟

ئاھ ئەگەر بمانتوانیایە ئەگەر بمانزانیایە.. ماڵ، پارە، ناوبانگ، وەکو با، وەکو کەفی سابوون، وەکو ئاوی ڕووبار، وەکو هەڵم.. دەفڕێ‌و دەڕوات. ئەوەی دەمێنێتەوە کەسایەتیە، ڕەوشتە، باشییە، ناسینی خۆتە. خۆزگە لەمە تێدەگەیشتین.

بەدرێژایی ڕێگا بەردەوام بوون لە قسەکردن، بەو جۆرەی کە تێگەیشتبووم، بەتول خان و کچەکەی دووکەسی دیندار بوون، زۆریان پێ خۆش بوو کە یارمەتی دایکم بدەن لەم بارە خراپەیدا. واتە نیازی ئەوەیان نەبوو کە دەست بەردارمان بن ئەمەش بۆ ئێمە جێگەی ئومێد بوو. بەڕاستی وەك دەڵێن: "خوا دەتخاتە ناڕەحەتیەوە، بەڵام لەبیرت ناکات."

ڕاستیەکی تر ئەوەیە کە هێشتا زۆر ناڕەحەتی سەختتر ماوە کە چاوەڕێمانە.

## ماڵێکی زۆر جوان

خانمی پزیشك بە ئوتومبێلە مۆدێل بەرزەکەی گەیاندینیە ئەو ماڵە تازەیەی کە لەگەڵ دایکی تیای دەژیان. ماڵێکی زۆر بەڕەونەق و ڕازاوە بوو، هاوشێوەی ماڵە کۆنەکەی ئێمە. کە گەیشتینە بەردەرگای ماڵەکە، هەستێکی زۆر ناخۆشم بۆ دروست بوو بەخۆمم وت:

– لەکوێوە بۆ کوێ؟ هەستم بە ناڕەحەتییەکی زۆر کرد، خۆم بە سوڵکەر دەهاتە پێش چاو. بەڵام ئەو دوو خانمە زۆر ڕێزیان بۆ دادەنان و

زۆر جـوان مامەڵـەیان لەگـەڵ دەکـردین. خـانمی پزیشـك کچـێکی ئاقـڵ و ئیماندار بوو.. بۆ ئاسودەکردنی ئێمـە زۆر باسـی گـرنگ‌و سـەرنج ڕاکێشـی دەکردەوە....

منــیش لـــەکاتی خوێنـــدنی ناوەنـــدی و ئامادەیمـــدا تەنانـــەت لەســـەرەتاکانی خوێنـدنی پزیشـکیمدا لـە زانکـۆ، لـەناو خەیاڵـە ڕەنگـاو ڕەنگەکانمدا بووم، نەمدەزانی بۆچی دەژیم؟ کێم؟ هەسـتم بـە دڵتـەنگی و ناڕەحەتی دەکرد. هەندێك لە هاوڕێکانم دەیانویست بـەرەو سـەرگەردانی و جوانیە پووچەکانی دنیام بەرن، هەندێکیش لە هاوڕێکانم لەوانـە بـوون کـە ڕاستییان پیشان دەدام کاتێك لەگەڵیان دەبووم تێدەگەیشتم کـێم؟ بۆچـی دەژیم؟

## مرۆڤ بێ ئامانـج دروست نەبووە

تێگەیشتم دروستبوونی گەردوون و مرۆڤ بێهودە نییەو، هەموو شتێك حیکمەتی خۆی تێدایە، مرۆڤەکانیش بۆ مەبەستێکی گـەورە بـەدیهێنراون. تێگەیشتم کە گەورەترین کـەم و کـورتی و ناتـەواوی زۆرێـك لـە مرۆڤـەکان ئەوەیە، کە نازانن بۆچی هاتونەتە دنیـاوەو؟ ئـەرکی سەرشـانیان چییەو؟ دەبێ چۆن بژین؟ خانمی پزیشك ئاماژەی بە کۆمەڵێك پرسی گـرنگ دا کـە تا ئەو کاتـە بـیرم لێ نەکردبوونـەوە، بـەڵام لـەو بارودۆخـەدا زۆر پێویسـتم پێیان بوو تا ڕادەیەك ئاسودەییان پێ دەبەخشیم.

بەدرێـژایی دانیشـتنەکەمان لەســەر قسـەکانمان بـەردەوام بـووین. لەبارەی مرۆڤ و ئەرکەکانی سەرشانی لەسەر ئەم زەوییە، بەلای منـەوە تـا بڵێی باسێکی گرنگ بوو، چونکە زۆر کات لە خۆم دەپرسی بۆچی دروست بووم و چۆن دەژیم؟! لەم دنیا گەورەیەدا ئەم هەموو نادادپەروەری‌و کارە

خراپ و ناڕەوانە بۆ دەبێ هەبن؟ پرسیارگەلێکی زۆر مێشك و دەروونمیان داگیرکردبوو. خانمی پزیشك وەك ئەوەی بزانێت کە چی لەناخ و دڵمدا دەگوزەرێ بەتەواوی ئەو شتانەی دەوت کە من پێویستم بوون. لەگەڵ گوێگرتن لەوان منیش بە پرسیارێك چوومە ناو باسەکەوە:

– مرۆڤ بۆ ئەوەی ئاگاداری هەموو ئەو شتە ڕاستەقینە و هەست بزوێنانە بێت، چی بکات بۆ ئەوەی ڕێگایەکی ڕاست بدۆزێتەوەو ونی نەکات؟!!

خانمی پزیشك بەڕێز و حورمەتی خۆیەوە لە قسەکانی بەردەوام بوو و وەڵامی منیشی دەدایەوە.

– بە خوێندنەوەو، بیرکردنەوەو، تێڕامان.

بیرکردنەوەو تێڕامان بۆ مرۆڤ گەورەترین عیبادەتە، واتە تێگەیشتن و خوێندنەوەی کتێبی گەردوون، هەروەها بیرکردنەوە لە خاڵە پڕ لە حیکمەتەکانی. ئەو کاتە مرۆڤ تێدەگات بۆچی دروست بووە؟ ئەرکی چییە؟ خۆی تەسلیمی خودا دەکات، ئەو خۆتەسلیم کردنەش خۆشییەکی نەبڕاوەیە، کە چێژی ڕاستەقینەی تێدایە.

## ڕووداوەکان پێویستیان بە تێڕامان و هەڵوەستە لەسەر کردنە:

مرۆڤ دەبێت بەردەوام بیربکاتەوەو لە دەوروبەری ڕابمێنێ، لە ڕووداوەکان، لەوانەی دەیبینێ و، ئەوەی بەسەری دێت، دەبێت هەڵسەنگاندنیان بۆ بکات، دەبێ حیکمەت و پەندی ئەو شتانە بدۆزێتەوە. ئەگەر بەیانییەك لەخەو هەستایت و خۆت لە جیهانێکی نەناسراوی ڕەنگاو

ڕەنگ، خۆت لە سووچی جێگەیەکدا ببینیتەوە، کە هیچ ئاشنا نیت بەو شتانەی لە دەوروبەرتن، ئایا دەتوانیت بەردەوام بیت لە ژیانت وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت! ؟؟

بەڵێ، ئێمە کاتێك چاومان کردەوە وەك خەونێك خۆمان لە جیهانێکی نامۆ و پڕ لە سەیروسەمەردا دۆزییەوە، جیهانێك پڕ لە سەیرو سەمەرە، وەکو خەون بینین، هەروەك لەم گەردوونەدا هەسارەیەکی تر نییە، وەك زەوی بەو شێوە جوانە خۆری تیا هەڵبێ و ئاوا بێت... لە چرکەیەکدا هەزارەها تەن ئاو بە هەوادا دەچێت ، هەر بەو بڕەش دەبارێت و دێتەوە خوار، ئەم زەوییەمان وەك ڕەنگاو ڕەنگی فەرشێکی ڕاخراو لێ دەکات، گیان بە بەر هەموو شتێکدا دەکات. جێگەیەکی تر نییە وەك ئەم زەویە ئەو ئەستێرە بەرزانەی بەو جوانیە لێوە دیاربێت، تاڤگەکان، شاخەکان، دەریاکان، دەشتەکان، بیابانەکان، هەموو لێرەن دەنگەکان و بۆنەکان هەمووی جیاوازن لەم جیهانە، بزانە لەدەوروبەرماندا بە ملیۆنەها جۆر گیانەوەر هەیە. لەدنیایەکی لەم جۆرەدا ساڵێك لە ساڵان، ڕۆژێك لەڕۆژان چاومان کردەوەو بەبێ ویستی خۆمان هێنراین. پاشان هەر بە بێ ویستی خۆمان ڕۆژێك ئەم وڵاتی خەونانە جێدەهێڵینەوە. نهێنییەکانی دنیاو گەردوونیش، تێڕامان و تێگەیشتنە لە: ((ئەمانە چین؟ بۆچی دروست کراون؟ ئێمە بۆ لێرەین؟)) و چەندەها پرسیاری تر کە ڕۆژانە دێتە بیرو خەیاڵمان. ئایا نابێت مرۆڤ سەرەتا خۆی و ئەو شتانەی پەیوەندی بەوەوە هەیە بناسێت و، ئەرکی سەرشانی خۆی بزانێت!.. ئایا ئەمە مەرجی بوونی مرۆڤ نییە؟! بیر بکەرەوە.. لەنەبوونەوە هاتینە بوون، لەسکی دایکمانەوە هاتینە ئەم دنیایە ڕزقمان ڕاستەوخۆ ئامادەبوو، کە

شــیری دایکمانــه.. پاشــان بەچــاودێرییەکی بــاش پــەروەردەکراین بەمیهرەبانییەوە پێگەیەنراین، ئەگەر میهرەبانی دایك و سۆزی باوکمان نەبوایـە، کـێ دەیتـوانی بەرگـەی ئـەو ناڕەحەتیانـەی بچـووکیی ئێمـە بگرێت!!

بیربکەنەوە...

لەوکاتەی هاتووینەتە دنیاوە چوار دەورمان پڕە لە نیعمەت، خۆر گەرمی کردینەوە، ئاو پاکی کردینەوە، تینوێتی شکاندین، خواردن تێری کردین، هەوا بە زیندوویی هێشتینیەوە.. و هەموو ئەمانە بێ زەحمەت و بێ کرێ و نرخ هاتنە دەستمانەوە.

بیربکەنەوە...

ئەگەر ئەقڵێك نەبوایە بۆ تێگەیشتن لەم ژیانە، چاوێك بۆ بینینی دنیا، گوێ بۆ بیستنی دەنگەکان، زمان تا تامی شتەکانی پێ بکەین، لووت تا بۆنەکانی پێ جیابکەینەوە، ئەگەر ئەمانە نەبونایە؟!! ئایا ئێمە چەند نرخمان بەم ئەندامە گرنگانە دەدا؟! چەند دینار!!

بیربکەنەوە...

ئەو پارووەی دەیخەینە دەممان تا ئەوکاتەی تەواو هەرس دەبێ و دەبێتەوە پاشەڕۆ و فڕێ دەدرێت بەهەزارەها شوێندا دەڕوات و چەندەها ئەندام ئیشی لەسەر دەکەن، کە ئێمە هەر ئاگاداریش نین، ئەوەی تەنها هەستی پێ دەکەین تامی ئەو پارووەیە، ئەی ئەگەر ئەو ئیشانەی دەم و ددان و گەدەو هەموو ئەندامەکانی هەرس دەیکەن ماندووبوونی خۆمانی بویستایە چی دەبوو؟! ئەگەر ٢٤ کاتژمێری ڕۆژێك بخەینە سەریەك خەریکی ئەو کارانە بووینایە کە گەدە دەیکات، هێشتا بەشی نەدەکردین،

ئایا ئێمە چەندە ئاگاداری ئەم سیستەمی کارو ڕێك و پێکییەین لە ئیشکردنی ئەم ئەنامانە؟

## بەقوڵی بیربکەنەوە

ئەگەر لەبەردەم ئەم دنیا جوان و گەورەیەدا چاومان نەبوایە کە ببینین؟! گوێمان نەبوایە ئەو دەنگە جیاوازو خۆشانە ببیستین؟! ئەگەر زمان نەبوایە بۆ تامکردنی تامە جیاوازەکان؟! ژیان چەندە سەخت دەبوو؟ تەنانەت بیرکردنەوەش لێی ناخۆشە. کەواتە ئەوەی ئەم گەردوونەی دروست کردووە هەرئەوەیشە مرۆڤی دروست کردووە. چونکە هەردووکیانی بۆیەك گونجاندووە و تەواوکەری یەکن.

بیربکەنەوە..

هەرکەسێك دەبێت نرخی ئەو ئەرك و کارانەی کە لەسەرشانیەتی بیدات، ئایا کەسێك بەدرێژای تەمەنی ئەو نیعمەتانە بەکاربهێنێت نابێت نرخەکەی بدات؟! کاتێك تەنانەت یەك نەفەس هەوا، یەك پەرداخ ئاو، پارویەك نان بەخۆڕایی دەست ناکەوێت، ئەی تەمەنێك بەکارهێنانی ئەو نیعمەتانە بەبێ نرخ، تەمەنێك ژیان بە خەرجیەکی زۆر، چۆن دەکرێت ئەو کەسە هەروا بێ هیچ شتێك بێ هیچ لێپرسینەوەیەك لە گۆڕەکەیدا بخەوێت!!؟ ئایا کەسێك کە چاوی نەخۆشە دوای خەرجکردنی پارەیەکی زۆر لەپێناو چارەسەردا، ئەو کات تێناگات ئەو چاوە ساغانە چەند گران بەهان!! کەتەنانەت وابیردەکاتەوە بۆ بەکارهێنانیشیان هەقە پسوڵەیەکی بەنرخ وەربگرین. ئەمە تەنها چاوێك.. ئەی دڵی، ئەی ئەقڵی، گەدەی، جگەری، قاچەکانی، دەستەکانی، ئەی بۆ هەموو ئەو ئەندامانەی بەبێ نرخ

بـەكاريان دەهێنێـت ئايـا ئـەو كەسـە دەكەوێتـە ژێـر قـەرزێكى چـەندە زۆرەوە!!؟ ئايا نابێت بيرلەمانە بكاتەوە؟!

بيربكەنەوە...

خودايەك كە ئاگادارە بـەوەى چيمان پێويستـەو بـەپێى پێداويستـى ئێمە ئەم گەردوونەى دروست كـردووە و ئـەوەى دەمانـەوێت خستويەتيە بەردەممان..

ئێمە لە كوێوە هاتين؟ بۆچى هاتين؟ دەچينەوە بۆ كوێ؟ ئەى كـێ و چـۆن لێپرسـينەوەمان لەگـەڵ دەكـات؟ هەركەسـێك كـە ئـەقڵى هـەبێت دەبێت بير لەمانە بكاتـەوە؛ ئـەم گەردوونـە دروسـتكەرێكى هەيـە، هـەموو شت هى ئەوەو ئەو دروستى كردووە، ئێمەيشى بۆ تاقيكردنـەوە ناردوەتـە سەر زەوى. دواى مردنيش ڕۆژى لێپرسينەوە دێت.

بەدڵنياييەوە ئەوەى كە پاداشت و سزا هەروەها سەختى يان ئاسانى لێپرسينەوە ديارى دەكات كاروكردەوەى مرۆڤەكانە لەدنيادا.

خودا لەو دادگاييە گەورەيـەدا خـاوەنى گـەورەترين دادپەروەرييـە.. بێگومان هەمووان وەك يەك سەير ناكات، زاڵم و زوڵم لێكراوەكان، ئەوانـەى بەكەيف و ڕابـواردن دەژيـان لەگـەڵ ئەوانـەى ناخۆشـى و نارەحـەتيان زۆر ديوە بێگومان نايانخاتە ڕيزێكەوە.. هەموو كەس پاداشـت و سـزا بـە پێـى ژيانى وەردەگرێت، هەمووان لەوێ بە هـەقى خۆيـان دەگـەن، چـونكە ئـەم دنيايـــە تاقيكردنەوەيـــەو لـــە قيامەتيشـــدا وەڵامـــى تاقيكردنـــەوەكان وەردەگرينەوە.. مرۆڤ دەبێت زۆر باش بير لەمانە بكاتەوە.

ئەمانەى خانمى پزيشك باسى كردن زۆر سـەرنج ڕاكێش بـوون، وەك ئـەوەى ئـاو بكـات بـە نـاخى سـووتاوماندا، ڕاسـتيەكەى هـيچ بـەبيرم دا

## خەوێکی سەیر

بەدرێژایی ئەو شەوە هەر بیرم لەو بابەتانە دەکردەوە کە خانمی پزیشك باسی کردن، بەدەم بیرکردنەوە خەوم لێکەوت، لەگەڵ دایکم لەیەك ژووردا نووستین. ئەو شەوە خەوێکی زۆر سەیرم بینی کە کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسەر ژیانم. خەوەکە بەم جۆرە بوو..

لەگەڵ دایکم لە شوێنێکی نامۆدا بووین کە نەماندەزانی کوێیە، پێیان وتین: چاوپێکەوتنێك ساز دەکرێت، بینیم هەموو بەرەو ئەوێ ڕادەکەن منیش دەستی دایکم گرت و بەرەو ئەو لایە ڕامان کرد.. کە گەیشتینە ناو قەرەباڵغییەکەوە لە دەنگێکی نەرم و، کاریگەر نزیك دەبووینەوە. ئەو دەنگە ئەوەندە خۆش بوو کە وەك مۆسیقایەکی ئارام هەموو دەروونی ئاسوودە کردین. زۆر پەرۆش بووین بۆئەوەی بزانین خاوەنی ئەو دەنگە شیرین و کاریگەرە کێیە؟! هەمووان لەیەکتریان دەپرسی...

تا یەکێك وتی:

– بێدەنگ بن و گوێ بگرن، بۆتان دەردەکەوێت کێیە.

هەمووان پێکەوە بێدەنگ بوون، لەو بێدەنگیەدا ئەو دەنگە کاریگەرەمان دەبیست کە دەیوت:

– من هاوڕێیەکی لاوازو بێ توانای ئێوەم، بەدیعو زەمان منی ناردوەتە ئێرە، بە من دەڵێت (مامۆستا). ئێمە هاتووین تاکو ڕاستیەکتان بۆ باس بکەین، باش گوێ بگرن.... هەموو ئادەمیزادێ مردنی لەپێشە.. هیچ کەس ناتوانێ لێی ڕابکات، ڕەنگە لە هەرچرکەیەکدا بانگ بکرێین.. مردن دەروازەیەکە بۆ ئەو دادگاییە گەورەیە، ئێستا لێتان دەپرسم:

- ئامادەن بۆ مردن؟

ئەم پرسیارە قەرەباڵغیەکەی هەژاند، هەموو پێکەوە دەیان وت:

- نەخێر

مامۆستا بەردەوام بوو:

- ئەوانەتان کە ئامادەی مردن نین بەتەمای چین؟ ئەگەر لەکاتێکی چاوەڕوان نەکراودا (ئیزرائیل) لەدەرگاتان بدات چی دەکەن؟ بەکام بەندایەتی و کردەوەی جوانەوە وەڵامی دەدەنەوە؟

لەبیرتان بێ.. ئەمە تاقیکردنەوەیەکی گەورەیە کە دووبارە نابێتەوە.. ئەوانەی کە شکست دەهێنن و ئەو هەلەیان لەدەست دەچێ دووبارە هەلیان بۆ نارەخسێت. کەواتە مرۆڤی عاقڵ ئەوەیە کە پێش ئەوەی لێپرسینەوەی لەتەکدا بکرێت، خۆی بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە ئامادە دەکات و هەڵسوکەوتەکانی لەو چوارچێوەیەدا ڕێکدەخات.

## گرنگترین کاری مرۆڤ (ڕزگارکردنی ئیمان)ەکەیەتی

لەبیرتان بێت گرنگترین شت لەژیانی مرۆڤدا ئەوەیە، کە ئایا ئیمان بەدەست دەهێنێت یان دەیدۆڕێنێت؟! ئایا ژیانێکی بەهەشت ئاساتان ناوێت لە بەرامبەر ژیانێکی پڕ لە ناخۆشی و ئازار و نارەحەتی ٥٠-٦٠ ساڵێکی دنیادا؟!

لەناو ئەو قەرەباڵغییەی کە لە بێدەنگییەکی زۆردا گوێیان بۆ ئەو قسانە گرتبوو وەڵامی "دەمانەوێت" درایەوە، ئەو وەڵامەش پێویستە بیری لێ بکرێتەوە:

– کەواتە ژیانتان لەگەڵ ئیمانتان بسازێنن، بە ئەنجامدانی فەرزەکان بیڕازێننەوە، بە دوورکەوتنەوە لە گوناهەکان بیپارێزن. درێژەی ئەم ڕاستیانە لە کتێبەکانی پەیامی نوردا هەن. ئەو کتێبانە بۆ سەردەمی ئێستا گەورەترین چارەسەرن. بۆ نەمان و پەرتەوازەبوونی ناڕەحەتیەکانی دڵ و دەروون و، نەمانی گومانەکانی مێشك و هزر ڕێگە چارەیەکی ناوازەیە. بەخوێندنەوەی تەفسیری قورئان بەڕزگاربوون دەگەن. هەرکەس ئەم ڕاستەقینانە بخوێنێتەوەو لێیان سودمەند بێت لەخزمەت ئیماندا ئەجرو پاداشتی دەست دەکەوێت. لە ناکاو دەنگەکە نەما. خەڵکەکەش دەیانویست بگەنە لای ئەو دوو زاتە بەڕێزە. بۆیە بەرەو لایان دەڕۆیشتن، بەڵام وەك ئەوەی هێزێك پاڵ بە قەرەباڵغیەکەوە بنێت، دەیان گەڕاندنەوە دواوەو هێمنیان دەکردنەوە.

کەسێك بە دەنگێکی بەرز:

– هێرش مەکەن.. ئارام بگرن، ئەو کەسانەتان کە زۆر ئاتاجن ئەم زاتە بەڕێزانە بانگتان دەکەن و گوێیان بۆ ڕادەگرن.

هەموو قەرەباڵغیەکە بە دیقەتەوە گوێیان گرت.

ئای مامۆستا ئای.. چ شتێکی کتوپڕو سەیر بوو.. ئەگەر دەزانی چ خۆشییەکمان چەشت!.. لەکاتێکدا بیرم دەکردەوە، تۆبڵێی ئێمە یەکەم کەس نەبین کە بانگ دەکرێین؟! ئای خوایە.. چەند سەرمان سوڕما.. نەمان دەزانی چی بکەین لە خۆشحاڵیماندا.

لەگەڵ دایکم دەستی یەکمان گرت و بەناو قەرەباڵغییەکەدا گەیشتینە سەر سەکۆکە. لەبەردەم ئەو دوو زاتە بەڕێزو ڕووخسار

شیرینەدا ڕاوەستاین. خەریکبوو لە خۆشحاڵیدا دڵمان دەوەستا. پێش ئەوەی ئێمە باسی دەردی خۆمان بکەین:

دەستیان کرد بە وتەکانیان:

– پیرۆزبایتان لێ دەکەین. مەترسن بەتەنها نین. گەورەترین یارمەتیدەرتان خالقی گەردوونە. پشت بەو ببەستن. لە تاقیکردنەوەی ئەم دنیایەتاندا بە سەرمایەیەکی گەورەوە دەڕۆنەوە. لەبیرتان بێت خوای گەورە هیچ شتێکی بێ ماناو مەبەست دروست نەکردووە. لەو یاخی مەبن و، پشت و پەناتان با هەر ئەو بێت. ئێوە پاداشتێك چاوەڕێتان دەکات، ئەگەر بەچاو ببینرایە هەموو کەس ئیرەییان پێ دەبردن. دەی بڕۆن بە دوعای خێر.

## ئەی ئەوانەی دایکم بینی بووی؟!

خەبەرم بوویەوە.. من لە کوێم؟! ئەمانەی بینیم ڕاست بوون؟ بەڵێ ئەمە خەون بوو.. ئەمە ناوی خەوە. چ پەیوەندییەکی بە ڕاستەقینەوە هەیە؟! ئەگەر بە ئاگا بێمەوە دووبارە دەیبینمەوە؟ زاتە بەڕێزەکان، بەدیعوزەمان سعید نورسی، تەفسیری قورئان.. پەیامەکانی نوور.. ئەمانە مانایان چییە؟ بەڕاستی ئەگەر وایە ئەم هەموو نارەحەتیە بۆچی؟ لەبەر خۆمەوە ئەمانەم دەوت و قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد کە دایکیشم بە ئاگا هات. زۆر ترسا کاتێ بەو جۆرە منی بینی لەبەر خۆمەوە قسەم دەکرد.

– خێرە کوڕم!.. شتێك بووە؟

هێشتا لەژێر کاریگەری ئەو خەوە سەیرەدا بووم.

– خێرە.. هیچ بووە؟ بەم جۆرە لەبەر خۆتەوە قسە دەکەیت!

هێواش هێواش دەهاتمەوە بە خۆمدا.. ئەوانەی بینی بووم خەریك بوون دەهاتنەوە بەرچاوم.

– بەڵێ دایە.. خەونێکم بینی..

– خێر دەبێ إن شاء الله ڕۆڵەکەم. خوای گەورە بەخێری بگێڕێت. باسی بکە بزانم چیت دیوە؟ ئەوەندەی کە بیرم دێت لەگەڵ گێڕانەوەی مندا دایکم فرمێسکە ڕوونەکانی لەچاویدا دەهاتنە خوار. بەجۆرێك هەنسکی دەدا، بەجۆرێك دڵی گەرم بووبوو... سەرم سوڕمابوو.. ئەو هەموو خۆڕاگری و بەرگەگریەی دایکم کە لە ناخۆشترین نارەحەتیەکانیشدا وای نەدەکرد.. بۆچی ئاوای لێ هات. کە وەك منداڵ دەگریا.

## تۆ زۆر گەورەی خودایە

دەستەکانی کردەوە، زۆر لەقوڵایی ناخ و هەستیەوە دەستی کرد بە نزاو پاڕانەوە:

– خوایە تۆ چەندە گەورەیت! توانات بەسەر چیدا نییە! تۆ هیچ بەندەیەکت ناخەیتە دەردو نارەحەتیەوە. ئێمە بکە بە بەندەی شیاوی خۆت. لە پەروەردەکراوی و، لە بەندایەتی خۆت جیامان مەکەرەوە. تۆ هەر شتێك لەگەڵ هەزارەها حیکمەتدا دەکەیت. بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی بەمە نازانین و هەستی پێناکەین یاخی دەبین و دەکەوینە هەڵەو تاوانەوە. یارەبی ئێمە لە حضوری پاکی خۆتدا وەرگرە. لە قیامەتدا شەرمەزارو ڕوو ڕەشمان مەکە. لەو لێپرسینەوە گەورەیەدا سەرشۆڕو بێ چارەمان مەکە. لەم دنیایەشدا ئارامی و پشتیوانیمان پێ ببەخشە.

دایکم چی بەسەرهات بوو؟ لەناکاو هەستی بەچی کردبوو، دەرکی بەچی کردبوو کە بەو جۆرە دەپاڕایەوەو نزای دەکرد؟! ئاشکرابوو کە

دایکیشم شتانێکی بینیوه، ئەگینا بۆچی لەناکاو بەو جۆره جۆش و خرۆشییەوه دەپاڕایەوه ! پرسیم:

– دایکه چی بووه؟ تۆش خەونت دیوه؟

لەگەڵ نیگا قوڵ و چاوه فرمێسکاوی و ماندووەکانیدا سەری لەقاند:

– زۆر شت بووه کوڕم.. خوای گەورەم گەورەترین ئومێد، گەورەترین نووری پیشان داین. ئیتر دەبێت پێکەوه بە ئارامگریو شوکرو سوپاسەوه سینەمان بکەینەوه بۆ ناڕەحەتیەکانی ژیان. وتم:

– باشه.. بەڵام نەتوت چی بووه؟!!

لەنێوان وتن و نەوتندا بە دوودڵی و ڕاڕاییەوه لەکۆتایدا ئەو ڕاستیه سەیرو باوەڕ پێ نەکراوەی وت:

– کوڕم.. منیش هەمان خەوم بینی. خوای میهرەبان هەردووکمانی پێکەوه دڵنەوایی کرد.

ئەی خودایه... ئەمه چ بارودۆخێکی سەیربوو.. کەواته دایکیشم هەمان خەوی دیوه!! بەڵام ئەوه چۆن دەبێت؟ شتی ئاوا نەبیستراوه...

کاتێ من لەبەر خۆمەوه ئەمانەم دەوت دایکیشم وتی:

– کوڕم ئەگەر ئەو بیەوێت دەبێت. ئەوەنده بەسه ئێمه بەندەی شیاوی ئەوبین.

– باشه دایکه تۆ لەبارەی بەدیعوزمان سەعیدی نورسی و پەیامەکانی نوورەوه پێشتر بیستبووت ؟!

دایکم وتی:

– بەڵێ کوڕم. من ئەو زاته پیرۆزو گەورەیەم لە باوکمەوه بیستبوو.

باوکی ڕەحمەتیم کاتێک لە (ئیسپارتا) سەرباز بووە چووەتە زیارەتی. لەوکاتەوەی گەڕابوویەوە بەردەوام پەیامەکانی نووری دەخوێندەوە بۆ ئێمەشی باس دەکرد. بەڵام نازانم دواتر کتێبەکان چیان لێهات! دەبێت سوود لەو کتێبانە وەربگیرێت لەکاتی نارەحەتی و سەختیو دژواریەکاندا .

بەرەبەیان بوو... لەو خەوە شیرین و پڕ مانایەمان بە ئاگاهاتبووین، دیسان لەگەڵ ڕاستیەکانی ژیاندا بەرەو ڕوو دەبووینەوە.

لەبەردەممدا ڕوداوگەلێك هەبوون کە تواناو ئارامی مرۆڤ بەرگەی ناگرێت، ئەو نارەحەتیانەی ئەو دیمەنانەی مرۆڤ پەرێشان دەکەن. وەك ئەوەبوو هەر ڕۆژێك کە دێت، هەر ڕۆژێکی ڕابردوو شیرنتر دەکات. بەڵام ئیتر گەورەترین دڵنەوایمان هێزی باوەڕبوون بە خودا بوو، کە جگە لەو دەرگایەکمان نەبوو لێی بدەین.

لەگەڵ دایکم دەڕۆیشتین بۆ نەخۆشخانە، دەڕۆیشتین، بەڵام کە دەبوو بە ئێوارە بێ ماڵ و حاڵ دەماینەوە. خودا جارێك مرۆڤی باشی تووش کردین. ئەی بەیانی؟ ئەی ڕۆژەکانی دوایی؟! ئای خودایە مرۆڤ کاتێك بیری لێ دەکاتەوە شێت دەبێت. ئەوەندە ناخۆشی لە ناخیدا دێت و دەچێت، ئەو دڵ ئارامیە مەعنەویە ون دەبێت. لەجیاتی ئەوە دەیخاتە ئازارێکی بێ کۆتایی کە وەك پشکۆ دەیسوتێنێت. کە چووینە چێشتخانەوە بەتول خان سفرەیەکی زۆر جوانی ئامادە کردبوو. بەڵام کوا حەزو ئارەزوومان بۆ خواردن!؟

خانمی پزیشکیش دیار نەبوو، بەتول خان وتی:

- چووەتە جێگەیەك ئێستا دەگەڕێتەوە.

## خانوویەکمان دۆزیەوە کە بمانشارێتەوە

ئێمە خەریك بووین نانی بەیانیمان تەواو دەکرد. خانمی پزیشك بەو خوێن گەرمی و هەڵسوکەوتە دۆستانانەیەوە گەڕایەوە وەك ئەوەی بیەوێت هەواڵێکی زۆر خۆشمان پێ بڵێ، پێکەنین لە ڕووخساریدا دەبینرا.

— لەگەڵ ئێوەدا دەبێت لەسەر بابەتێکی گرنگ قسە بکەم. دەمەوێت بێ ئەوەی قسەم پێ ببڕن گوێم لێ بگرن، دواتر پێکەوە بڕیار دەدەین. بە پەرۆشیەوە گوێمان بۆ خانمی پزیشك گرتبوو.

— لە هەژارترین و پێویستترین کاتەکانماندا هاوکاری ئێمەتان کردو ئێمەتان گەیاندە ئەم ڕۆژە. ئەگەر یارمەتی ئێوە نەبوایە، یان من لەگەڵ کارە خراپەکانی ئەو ڕۆژانە تێکەڵ دەبووم و هەر لەسەرەتای ژیانمەوە دەڕووخام، یان هەر بەردەوام دەبووم لەو ژیانە سەخت و ناخۆشە. ئەمڕۆ کە بوومەتە پزیشك و ئەم تواناو دەرامەتەم هەیە، سەرەتا بە ئەمری خوای گەورە بووە پاشان بە هاوکاریتان و پاڵپشتی ئێوە، ئێستایش نۆرەی ئێمەیە خزمەت و هاوکاری بکەین. ئەمەش حیکمەت و دەرسێکی ڕوون و بچووکی پەروەردگارە. لەگەڵ دایکم بە مەمنونیەوە تا ئەو کاتەی بتانەوێت ئیزنی مانەوەتان لەم ماڵەدا پێ دەدەین. ئەمە بۆ دایکیشم زۆر باش دەبێت. چونکە من بەم نزیکانە دەچمە ماڵی خۆمەوە (ژیانی هاوسەری پێك دەهێنم). دایکم بەتەنها دەمێنێتەوە. دەتوانن دۆستێکی گیانی ئەو بن.

بەڵام بیرم لێ کردوەتەوە.. سەرەڕای ئەم هەموو ئارەزووەی ئێمە، ڕەنگە ئێوە لێرە ئاسوودە نەبن. ئێوە پێویستتان بە خانوویەکە، کە هی خۆتان بێت. دیسان بە هەموو توانامانەوە لەگەڵتان دەبین.. بۆ ئەمەش

خانوویەکمان بۆ دۆزیونەتەوە، خانوویەکی بچووك و بیٚ فیزە، بەلاّم باوەڕ پێکراوو باشە. خانووکە هی دەستگیرانەکەمە، مۆڵەتم لیٚ وەرگرتووە تا هەرکات بتانەوێت لەویٚ بن.

بینیم دایکم دەستی بە ڕووخساریەوە گرتووەو هەنسکی گریان دەدات. دیسان ڕەشەبای ماتەمی دنیاکەی ئەوی گرتووە. گویٚ بیستبوونی ئەو قسانەو بەدەستهێنانی ئەو تواناو دەرامەتە نیعمەتێکی گەورەو دەگمەن بوو.. بەلاّم بۆ کەسێك کە لە هەبوونیەوە بکەوێتە نەبوونیەوە بەرگەگرتنی زۆر قورس بوو. دایکم بەجۆرێك بە هەنسکەوە دەگریا، بەتول خان و خانمی پزیشك چوونە لای تاکو هێوری بکەنەوە. منیش وەك شێتیٚ تەزیبووم. ڕاهاتبووم لەگەلٚ ئەو شتە سەیرانەی دەهاتە ڕێمان. دایکم وتی:

– هەرگیز قبووڵی ناکەم. ئەمە بۆ من زۆر قورس و گران دەبێت، هیچ شتێك وەرناگرم کە حەقەکەی نەدەم.

خانمی پزیشك بۆ ئەوەی دایکم ئارام بکاتەوە:

– ئێمە ئەم خانوەتان بە خۆڕایی پیٚ نادەین. تیایدا دەمێننەوە تاوەکو إن شاء الله سەلیم دەخوێنێت و هەقی ئەمانە دانە دانە دەداتەوە. زیاتر پێداگریمان نەکرد، چونکە لەبیٚ چارەییەکی زۆردا بووین. دەبووایە هەر جێگەیەکمان بدۆزیایەتەوە بۆ خۆمان. ئەگەر ئەوەمان ڕەت بکردایەتەوە چارەیەکی ترمان نەدەبوو. ئەو جێگەیە نهۆمی یەکەمی بینایەك بوو. کە بۆ ئێمە بەس بوو. خانمی پزیشکیش کە ڕایەخ و کەل و پەلەکانی ڕێکخستبوو. لەبەرامبەر دۆزینەوەی خانوویەکی ئاوادا دایك و کوڕ لە شوکرو سوپاسدا بووین هەرچەندە خاوەنەکەی کەسێکی تریش بێت، لە کاتێکدا هێواش هێواش خەریك بوو هەموو شتێك ڕێك دەبوو. دیسان

گەردەلولی پشێوی و نەهامەتیەکان، دیسان زنجیرەی ئازارەکان خەریك بوو دەستی پێ دەکردەوە.



# بەشی حەوتەم

## زنجیرەی نەهامەتیەکان

### پوختەی ئەم بەشە:

تاقیکردنەوە قورس و سەختەکان یەکێکیان تـەواو دەبوو یەکێکی تر دەستی پێدەکرد. بەر لەوەی بڵـێین (شکور ڕزگارمان بوو) دیسان یەکێکی تـر... بـەڵام تـا دەهـات بەرگـەگری و خۆڕاگریمـان کـەمتر دەبـوو، بـێ چـارە دەبـووین. ئەمـە تاقیکردنەوەیـەکی زۆر قـورس بوو.

## ناخۆشیەکان دیسان زنجیرەیان بەست

کاتێك لە نەخۆشخانە بە دیار ئازارە سەختەکانی خوشکەکەمەوە بووین، خانمی پزیشك بە هەناسە بڕکێوە خۆی گەیاندە لای ئێمە:

– فریشتە خان، هەواڵی مێردەکەتان هەیە؟

ئەو حاڵە ناخ سووتێن و بە ئازارەی خوشکەکەممان بیرچوویەوەو بە پەرۆشەوە بەرەو ئەو هەواڵەی خانمی پزیشك چووین کە پێی داین، دایکم وتی:

– چی بووە؟ لە کوێیە؟

منیش وەك ئەوەی کە هەواڵێکی زۆر خراپ دەبیستم بۆئەوەی بەرگەی ئەو ئازارە گیان سووتێنە بگرم، توند دانم بەخۆمدا گرت و دەستم خستە سەر سنگم.

– لە کەناری ڕێگەیەك دۆزراوەتەوە.

– دەژی؟

خانمی پزیشك یەکسەر نیگاکانی گۆڕا، لێوەکانی بە ئازارەوە دا بەیەکدا:

– بەڵێ.. بەڵام....

تەواوی نەکرد.

– بۆ خاتری خودا بیڵێ...

– لاشەی زۆر زیانی بەرکەوتووە، بەجۆرێك توانای ڕۆشتنی لە دەستداوە.

– ئۆه.. ئەمە بەس بوو بۆ ئێمە.. ئەم هەواڵە باشتر بوو لەوەی واماندەزانی مردوە، یان ون بووەو ناگەڕێتەوە، باشتر بوو لەوەی هەموو

کات لە ترس و ئازاری نەدۆزینەوەی ئەودا بووین. خانمی پزیشك ئێمەی گەیاندە ئەو نەخۆشخانەیەی باوکمی لێ بوو.

ئای خودایە..! دیمەنێکی زۆر سەیر بوو.. وەك بڵێی هەموو گیانی باوکمیان شکاندووە. هیچ جێگەیەکی بە سەلامەتی نەمابوو. ئەوانەش کە وایان لێ کردووە وایان زانیوە مردووەو، لە کەنار ڕێگەیەکدا فڕێیان داوەو، خێرخوایەکیش بینیویەتی و هێناویەتییە نەخۆشخانە. خانمی پزیشك زانیاری وەرگرت لەو پزیشکانەی ئەوێ. باوکم هۆشی نەبوو. سەری هەمووی برین بوو، جێیەکی نەبوو کە نەشکابێت. دەم و چاو و ڕووخساری هەموو برینپێچ کرابوو لە قۆڵی ڕاستیدا دوو شکاوی و، لە قۆڵی چەپیشدا چەند دانە درز و قڵیش هەبوون. بەڵام خراپی هەواڵەکەمان لە دواییدا بیست. باوکم لەبەر ئەو زەبرە زۆرانەی بەری کەوتووە. زیانێکی درێژ خایەنی پێگەیشتووە. کە بە درێژایی تەمەنی دەبێت لە جێگەدا بێت. ئای خوایە.. ئەمە چ نەگبەتییەکە؟ چ ئازارێکە؟ ئەمە چ جۆرە تاقیکردنەوەیەکە؟ ئێستا ئێمە دەبێ چی بکەین؟ بەتەواوەتی سەرسام و پەرێشان و بێ چارە مابووین.

## ئاه لەم بێ چارەییە..

خوشکەکەم لە حاڵی تێکچووندایە.. لە نەخۆشخانە ڕۆژ دەژمێرێت، باوکم هەموو ژیانی تەواو بوو بوو، هەموو تواناکانی کۆتایی هاتبوو، ئومێدی ڕووخابوو... ئەی منی گەنجی بێ ئەزموون کە ئەم بارەم پێ هەڵناسوڕێ..! دەی بزانم.. چۆن دەتوانم لەم بارە بێ چارەییە بێمە دەر؟! خودایە یارمەتی لای تۆیە.. زۆر بێ چارەین. خوا لێی ڕازی بێت خانمی پزیشك ماوەی سێ مانگ تەداوی و چاودێری باوکمی گرتە ئەستۆ.

شکاوی و له جێ چوونەکانی لەشی بەرەو باشی دەڕۆشتن، بەڵام ئیتر دەبوایە تەمەنی لە جێگەدا وەك ئیفلیجێك بێت. هێنامانەوەماڵەوەو لە جێگەی خۆی دامانناn. بەڵام باوکم بە تەواوی هاوسەنگی لە دەست دابوو، ڕووداوەکانی نەدەهاتەوە بیرو شتی بێ مانای دەوت. ڕێك وەك خوشکەکەم، کە بە ناڕەحەتی ڕۆژەکانی تەمەنی دەگوزەراند. باوکم ڕووبەڕووی ئەشکەنجەو ئازاری زۆر قورس دەبووەوە. ئەو ژیانە پڕ لە پیسی و خراپییە هەر دەبێت کۆتاییەکەی ئاوا بێت. کاتێك پارەی زۆربوو ئافرەتی زۆر وەك پەروانە و ماستاو چیەو بەرژەوەندی خواز وەك پەنجەی دەست بە دەوریدا دەسوڕان. کاتێکیش بینییان پارەی نەما، هەموو ماڵ و موڵکیان لە دەستی دەرهێناو بەم جۆرە توشی ئازاریان کرد. و وایان زانیوە کە مردووە و بەجێیان هێشتووە. ناخۆشترین و بە ئازارترین شت ئەوە بوو کە جگە لەوەی باوکم هەموو پارە و ماڵی لە دەستدابوو لە ناوەڕاستی کۆڵان بەجێیان هێشتبوو بە ئازارو ئەشکەنجەو بە تەنها. و ئێستا دەبوو یەك تەمەن بە ئیفلیجی بمێنێتەوە. ئەمە بە جۆرێك ئازاری دەدام کە باس ناکرێت. دەبوایە لەکەسانێك کە ئەمرت بەسەردا دەکردن ئەمر وەربگری و، لە کەسانێك کە یارمەتیت دەدان دەست پان بکەیتەوە، لە کەسانێك کە ڕۆژانێك تۆ نانت پێ دەدان نان وەربگریت... لەمە بە ئازارترو نەگبەتی زیاتر دەبێ چی بێت؟! ڕۆژەکان لەگەڵ ئەم هەموو ناڕەحەتییەدا دەڕۆشتن، بەڕاستی دایکم کەسێك بوو وەك فریشتە. سەرەڕای ئەو ئاگرە بۆ براوەیەی کە دەهاتە ڕێی لە پشت باوکمەوە دەلەرزی. بۆ ئاسودەکردن و خزمەت کردنی ئەو یەك خولەك دانەدەنیشت. ئایا بەرامبەر ئەو هەموو خراپییە چ خانمێك یاخی نەدەبوو؟! دۆستانی

وەك بـەتول خـان و كچـەكەی سـەلامەت بـن زۆر جـار لـەم لاو ئـەو لاوە یارمەتییان دەداین. بەڵام وەك دەڵێن: ((نانێك لە دەستەوە بێت سك تێـر ناكات)). خانمی پزیشك دوای ئەوەی هاوسەرگیری كرد زۆر كەمتر دەهاتـە سەردانمان. دواتر زانیمان كە هاوسەرەكەی ڕازی نەدەبوو. بەڵام دیسانیش سوپاسیان دەكەین. كرێـی ماڵەكـەیان وەرنـەدەگرت. ئەمـەش نیعمـەتێكی گەورە بوو.

## دایكی فریشتەم

دایكی بە وەفاو فیداكارم، زیاتر بەرگەی ئەو برسێتی و نەبوونیەمانی نەگرت و بەو حاڵەیەوە دەستی كرد بە كاری پاكردنەوەی ماڵان. مـن بەمـە پەرێشـان دەبـووم مامۆسـتا.. دەمـردم. وەك ئـەو خزمەتكارانـەی هـەموو ڕۆژێك دەهاتنە ماڵمان. ئێستا دایكم بەو نەخۆشییەی، بەو بـارە دەرونییـە خراپەیەوە دەچێت بۆ خزمەتكاری، شوشە دەسرێت، ئوتو دەكـات، جێگـا پاك دەكاتەوە.... سەیری ئەم حاڵـە بكـە. چۆن پەرێشـان نابیـت! چۆن ناڕوخێیـت؟! دایكـم بـەیانیان زوو هەڵدەسـتا، جێگـەی بـاوكمی پـاك دەكردەوە خـواردنی پـێ دەداو دەچـوو بۆ كـار. كـە لـە كـار دەگەڕایـەوە دەچـووە نەخۆشـخانە بـۆ سـەردانی خوشـكم. دوایـش دەگەڕایـەوە مـاڵ و پێداویستییەكانی بـاوكمی جێبـەجێ دەكـردو، وەكـو پەروانـە بـە دەوریـدا خزمەتی دەكرد. بـیری لێ بكەنـەوە.. لـەم پێشـبڕكێیەدا، لـەم بـەرەوپێش چوونەدا چ گیانێك، چ دەروونێك، چ خواستێك بەرگەی دەگـرت. منـیش لـە خوێندنگاكەم وەكو لاشـەیەكی بـێ گیـان ڕۆژم بەسـەر دەبـرد. هـەموو لـە ژیـانی خۆیانـدا بـوون، منـیش لـە نـاو ئـارەزوو خەیاڵـەكانی خۆمـدا وەك بـەردێكی بـێ ڕۆح دەسـوڕامەوە. لەگـەڵ كـەس هاوڕێیـەتیم نـەدەكرد،

لەبەرئەوەی چیم مابوو لەگەڵ ئەواندا بەشی بکەم؟! ئەوان پرسیارم لێ دەکەن و دیسان ناچار دەبم بیر لەو دیمەنە ئازاراویانە بکەمەوە. بەڵام لە شتێك بە تەواوەتی تێگەیشتبووم: دەبێت بخوێنم و کارێکم هەبێت کە خۆم خاوەنی بم. مرۆڤی کەوتوو هاوڕێی نابێ. من تەنها خۆم دەمتوانی خۆم ڕزگار بکەم. سەرەتا دەبێت خوێندن تەواو بکەم، دەبێت باش فێر ببم. ئیشێکی پەسەند کراوو یاسایم هەبێت. دواتر دەمتوانی بەو جۆرەی دەمەوێت بژیم. زۆر باش لەمە تێگەشتبووم.

## مامۆستای ئەدەبیاتم

نازانم کێ بۆی باس کردبوو... بەڵام مامۆستای ئەدەبیاتم هەموو شتێکی لە بارەی منەوە دەزانی. مامۆستا توران، مامۆستای ئەدەبیاتم کە لە تەمەنێکی مام ناوەندو کەسێکی دروست و باش بوو، لە هەمانکاتدا یاریدەدەری بەڕێوەبەر بوو. منی بانگکردە ژوورەکەی، لەو شتانەی کە بەسەرم هاتبوون لێی پرسیم.. بە فرمێسکەوە گوێی بۆ بەسەرهات و ڕووداوەکانم گرت. وەك باوکێکی ڕاستەقینە لە باوەشی گرتم و دڵنەوایی کردم، ئامادەیی خۆشی پیشاندا بۆ بەردەوام پشتیوانی و یارمەتیدانم. خوا لێی ڕازی بێت، زۆر هێزو ئارامی پێبەخشیم. جگە لەمانەش لە کافتریای خوێندگاکەمان ئیشی پێدام. لەبەرئەوەی کاتی خوێندنی من لە خوێندنگا تا نیوەڕۆ بوو، لە دوای نیوەڕۆوە لە کافتریای خوێندنگا کارم دەکرد. هەروەها تەختەی بۆیاخی بۆ کڕیم، پێڵاوی هاوڕێکانم و مامۆستاکانم بۆیاخ دەکرد. ئەمەش نیعمەتێکی زۆر گەورە بوو. هیچ نەبێت کەمێك دەمتوانی یارمەتی ئەو دایکەم بدەم کە بەردەوام هەوڵی دەداو ماندوو دەبوو.... مامۆستای ئەدەبیاتم هەوڵی دەدا لەملاو ئەولاوە زیاتر یارمەتیمان بدات.

هەربەوجۆرە کچەکەشی لەو ڕۆژانەدا پەیوەندی لەگەڵ من گەرمتر بوویوو. من و خەندە لەیەك پۆلدا بووین. کچێکی زۆر خانم و نەرمونیان بوو. لە هەر دەرفەتێکدا شتێکی دەدۆزیەوە تاکو گفتوگۆم لەگەڵ دروست بکات. من زۆر هەستم بەمە دەکرد. بەڵام لە بەرامبەر ئەو یارمەتی و هەوڵانەی ئەودا ئەگەر باوکی ببیبیستایە شەرمەزار دەبووم. لەبەرئەوە کەنارگیریم دەکرد لە خەندە. خەندە بە بیانوی دەرسێکەوە هاتە ماڵمان. لە نزیکەوە دایکم و باوکمی ناسی و ئاشنا بوو بەو ناڕەحەتی و بارە قورسانەی کە بەسەرمان هاتبوو. وتم إنشاءالله لەدوای ئەمەوە ئیتر واز دەهێنێت. بەڵام زیاتر خۆی دەهێنایە پێش و زیاتر بەزەیی بە خێزانەکەماندا دەهاتەوە و دەستی کردبوو بە یارمەتیدانمان. دایکم بەمە زۆر خۆشحاڵ بوو. بەڵام من بێتاقەت و شەرمەزار دەبووم. دەترسام لەوەی هەرکاتێ مامۆستاکەم بمبینێ پێم بڵێت:

- چاوەڕێی ئەمەم لە تۆ نەدەکرد.

## سەبری پێغەمبەرانەی دایکم

باوکم لە حاڵێکدا بوو کە بەرگەی نەدەگرت. ئەو ئیتر لە ناو جێگاکەی بێزار بوو بوو، لە بەرامبەر هەموو شتێك تورە دەبوو، هاواری دەکرد، دایکمی زۆر زۆر زویرو عاجز دەکرد. دایکیشم کە وەك فریشتەکان بوو، هیچ پێداویستییەك نەبوو کە بۆی دابین نەکات، سەرەڕای ئەوەش هیچ خۆشویستن و دەست خۆشییەکی پێنەدەگەیشت تەنانەت سوپاس کردنێك یان وتەیەکی (خوا لێت ڕازی بێ)، بێگومان لەو بارودۆخەیدا بە جۆرێك دەکرا لێی قبووڵ بکرێ. بەڵام لەوە گەورەتر بێ باوەڕی و نا سوپاس گوزاری باوکم بوو. کە لەنێوان هەموو قسەکانیدا دەیوت خوا

ستەمی لێ کردووم.. بۆ منت هێنایە ئەم حاڵە؟ هەموو جارێکیش دایکم بۆ ئەوەی باوکم ڕزگار بکات، پێی دەوت کە خۆی بداتە دەست خوداو، سوپاسی بکات، چونکە چارەیەکی تری نییە. بەڵام باوکم وەك ئەوەی دوعایەکی نەبێت زیاتر کفری دەکردو بەردەوام دەکەوتە ناو گوناهەوە. ئەو قبوڵی نەدەکرد کە هۆکاری ئەم حاڵەی ئێستای هەڵەو تاوانی پێشوی خۆیەتی. هەموو کات بەرپرسیاری ئەو حاڵەی خۆی (حاشا) دەخستە پاڵ خودا. بەم هەموو مەرج و حاڵەوە هێشتاش دایکم دڵی نەدەشکاند، بەردەوام ئەوەی لە دەستی بهاتایە لە خۆشەویستی و میهرەبانی پێی دەبەخشی. بەردەوام لە پشت سەرییەوە دەوەستا:

– ئەمەش دەخۆی؟ ئەوەشت بۆ بکەم؟ ئەوەشت بۆ بهێنم؟ بەم جۆرە بێ ئەوەی بێزار ببێت و، واز بهێنێت خزمەتی دەکرد. زۆریش چێژی لەم کارانەی وەردەگرت. کەسێکی نزیکمان کە ئەم حاڵەی دایکمی بینی بوو پێی وتبوو:

– تۆ چ جۆرە مرۆڤێکیت؟ کابرا بەو جۆرە قسە بە خوداو پێغەمبەر دەڵێت تۆش وەك منداڵ بە دەوریدا دێیت و، خۆشەویستی و میهرەبانی پێدەدەی! کەمێك لێی دووربکەوەرەوە با لە هەڵەکانی خۆی تێبگات. لەگەڵ ئەوەی ئەم هەمووە لەگەڵیدایت و یارمەتی دەدەیت سوپاسێکت ناکات. بەجۆرێك ڕەفتار دەکات وەکو بڵێی ئەو هۆکاری ئەو هەڵانەی خۆی نەبێت. کەمێك بیخەرە ئازارەوە. با ئیتر نرخی تۆ بزانێت کە لەبەر دەستی دایت. دایکی میهرەبان و خاوەن سۆزم ئەم قسانەی ڕەتکردەوە و وتی:

– نەخێر، ئەو چی دەڵێت با بیڵێت، بە هەر جۆرێك ڕەفتار دەکات با بیکات. هەرگیز لە خزمەت کردنی کەمتەرخەمی ناکەم.

یەکەم: لەگەڵ ئەودا زۆر ڕۆژی خۆشمان بە سەر بردووە. ئەمڕۆ کە ئەو کەوتووەتە ئەم حاڵەوە منیش دەبێت بەوەفابم بە پەیمانەکەم و لە ناڕەحەتترین حاڵیدا لەگەڵی بم و دەستی بگرم، ئەو چی دەڵێت با بیڵێت من لێی دوورناکەومەوە.

دووەمیش: ئەو گوناهەکانی لەسەر خۆیەتی. من سزای گوناهی ئەو وەرناگرم. ئەوە خودا دەیزانێت. لەوانەشە پەند لەم خزمەت کردنانەی من وەربگرێت و ڕێگای ڕاست ببینێت. ئیمان و ئاخیرەتی خۆی ڕزگار بکات. چۆن دەبێت لە ڕزگارکردنی کەسێك بوەستم و وازی لێ بهێنم تا لەگەڵ گوناهی تردا تێکەڵ بێت؟!

سێیەمیش: إن شاء الله ئەمە بۆ من گەورەترین تاقیکردنەوەیە. بە ئارامگرتن و خزمەتکردنی ئەو، ئاخیرەتی منیش ڕزگار دەبێت، خوای گەورە هیچ شتێك بێ حیکمەت نانێرێت. ئەمەشی وەکو تاقیکردنەوە پێداوم. ڕەنگە هاوسەرەکەم وەسیلەی ڕزگاربوونی من بێت.

سەرم سوڕمابوو.. ناڕەحەتترین و بە ئازارترین ڕووداوەکان بەم لێکدانەوە جوانە.. چەند بە ماناو ئارام بەخشانەیە ئەگەر لەڕوویەکی جوانەوە سەیری ڕووداوەکان بکەین. ئەگەر مرۆڤەکان لە ڕووبەڕووبونەوەیان لەگەڵ ڕووداوەکاندا بە ڕوویەکی باش و بە ئاڕاستەیەکی باش بۆیان بڕوانن، زۆرێك لە کێشەکان بەر لە دروست بوونیان چارەسەر دەبن.. بە تەواوی وەك بەدیعوزەمان دەفەرموێت: ((ئەوەی جوان ببینێت جوانیش بیر دەکاتەوە، ئەوەی باش بیر بکاتەوە چێژ لە ژیانی وەردەگرێت)).

# بەشی هەشتەم

## خەندە.. کچی مامۆستاکەم

### پوختەی ئەم بەشە:

سـەردانی مامۆسـتا تـوران بـۆ ماڵمـان، ورە و هێزێکـی دەروونـی گـەورەی پـێ دایـن. خەنـدەی کچیشـی کتـێبی (ئـەو پیـاوەی لـەدووی خـۆی دەگەڕێت)ی بەدیاری پێدام و، چاویشی هەر لەسەرم بوو...

## مامۆستا توران هاتە سەردانمان

دایکم زۆر کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەو خەونەی کە دیبووی، لەبەرئەوە ئەو پارە کەمەی دەستی دەکەوت کەم کەم کتێبەکانی (پەیامەکانی نوور)ی بەدیعوزەمانی پێدەکڕی. هەموو ڕۆژێك درەنگانێك، دوای ئەوەی باوکمی دەخەواند، کتێبی (پەیامەکانی نوور)ی دەگرتە دەستو چەند کاتژمێرێك دەیخوێندنەوە، پاشان دەیویست بەشە گرنگەکانی لەگەڵ من دا باس بکات. هەندێك جاریش پێکەوە دەمانخوێندەوەو لێی تێدەگەیشتین و سوودمان لێ وەردەگرتن. کاتێکیش خەریکی ئیش بوو لەماڵەوە گوێی لە کاسێتی پەیامەکانی نوور دەگرت و هەم ئیشی دەکرد، بەڵام باوکم بەمانە زۆر بێزار دەبوو:

– دیسان ئەمانە؟! ئێوە جگە لەخوا و پێغەمبەر هیچی تر نازانن؟

بەم جۆرە دایکمی ئازار دەدا. دایکیشم هەرگیز بەرەوڕووی نەدەبوەوەو زویری نەدەکرد.

– باشە هاوسەرم ...ئێستا لای دەبەم.

دایە... دایە ئاخۆ دایکێکی وەك تۆ دووبارە دەبێتەوە! ئاخۆ دایکێکی وەك تۆ و هاوسەرێکی هاوشێوەی تۆ هەبێ؟! یان دایکی هەمووان بەم جۆرەن! بەڵێ... هەمیشە دەڵێم.. هەموو کات دووبارەی دەکەمەوە گەورەترین شانسو بەختەوەری من ئەوەیە کە خاوەنی ئەو دایکەم و گەورەترین بێ چارەییشم ئەوەیە کە خاوەنی ئەو باوکەم. دایکم جارجار منیشی ئاگاداردەکردەوە:

– ئامان کوڕم... باوکت زویر نەکەیت. ئەو زۆر ئازار دەچێژێت، ئەو کەساسیی و کەوتنە سەر جێگەی پێ قبووڵ ناکرێت، لەبەرئەوەیە کە

بەرگـە نـاگریێ و تـوڕە دەبـێ و هاواردەکـات. هـەرگیز بـەرەو ڕووی نەوەستیت، لـەم کاتـە قـورس و ناڕەحەتەیـدا زویـری نەکـەیت. ئـەو ڕۆژە دیسـان بـەردەوام بـوو لـە قسـە ناشـیرین و کەللـە ڕەقیـەکانی لەبەرامبـەر دایکمـدا، منـیش کـە بـەزۆر خـۆمم گرتبـوو تـاکو نەتەقمـەوە. لـەو کاتـەدا زەنگـی دەرگـا لێیـدا، کـە کردمـەوە... میـوانێکی بانگهێشـت نـەکراو... مامۆسـتای ئـەدەبیاتم (مامۆسـتا تـوران) لەگـەڵ خێزانەکـەی و کچـەکەی (خەندە) لەبەر دەرگاکەبوون. لەڕاستیدا هەم شڵەژام هەم سەرم سوڕما.

## کتێبی پەیامەکانی نوور

پێشوازیمان لێکردن بۆ ژوورەوە. هەمووان یەکتریان ناسی.

مامۆستا توران چاوی کەوتە سەر کتێـب و کاسـێتەکانی پەیامـەکانی نوور:

- چەندە جوانە -بەم شێوە جوانە هاتە ناوەوە- کەواتە ئێوەش ئەمانە دەخوێننەوە!

دایکم وتی: هەوڵ دەدەین سوودیان لێ وەربگرین.

- زۆرخۆشـحاڵبووم، بـڕوا بکـەن زۆرم پێخـۆش بـوو. ئێـوە گـەورەترین چارەسەری دەروونیو ڕۆحیتـان بـۆ ئاسـودەیی دۆزیوەتـەوە. کەواتـە مـن ئیتر هیچم نییە پێتانی بڵێم.

لەو کاتەدا دیسان باوکم بەپێچەوانەی هەمووان دەسـتی بەقسـەکردن کرد:

- مامۆستا، ئەمانەی ئێمـە مێشـکیان تێکـدراوە، نـەکا ئێـوەش وابـن؟ ئەمان جگە لەخوا شتێکی تر نازانن، ئـەم حاڵـەی خۆیـان نـابینن، سـەیری ئەو ناڕەحەتیانە ناکەن کە بەسەریاندا دێـت، هـەر خـەریکی وتنـی خـودا-

خودان. دایکم بۆ وەستاندن و ڕێگەگرتن لەو جۆرە قسەکردنەی باوکم هاتە ناو قسەکان:

– هاوسەرەکەم لەبەرئەوەی ئازارو ناڕەحەتی زۆرەو بێزارە، هەندێك جار هەستەکانی لەدەست دەچێت و نازانێت چی دەڵێت. لەخواوە بوو کە باوکیشم بێ دەنگ بوو.

لەماڵێکی خاکی و سادەدا و هەر کەس لە جێگەیەك دانیشتین. خەندە چاوەکانی هەر لەسەرم بوو، بەردەوام لەمن ورد دەبووەوە، ئەوەندە ناڕەحەتو نائاسودە بووم. هەموو ئەوانەی لەوێ بوون هەستیان کردبوو، خەندە جانتاکەی کردەوە، کتێبێکی لەناویدا دەرهێناو، وتی:

– سەلیم، دەمەوێ کتێبێکت بەدیاری پێ بدەم، قبووڵی دەکەیت؟

سەرم سوڕما، بێگومان دەبوو وەریبگرم، چارەیەکی ترم نەبوو؟ دەستی ڕاگرتبوو (کتێبەکەی بۆ درێژ کردم).

## ئەو یاداشتەی خەندە بۆی نووسی بووم

ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت... ناوێکی سەرنج ڕاکێش بوو، کتێبەکەم کردەوە... ئەو ڕستە پڕ مانایەی کە خەندە تێیدا بۆی نووسی بووم.. ((ئەو کتێبەی بووە هۆکاری دۆزینەوەی خۆم، بۆ دۆستایەتی هەمیشەییمان ئیمزا دەکەم...خەندە)). ئەو کتێبەی بووە هۆکاری دۆزینەوەی خۆم، ئەمە مانای چییە؟! بەرلەوەی بپرسم لەلایەن مامۆستا تورانەوە ڕوونکردنەوە دەستی پێکرد:

– سەلیم.. ئەو کتێبە خەندە بەدیاری پێشکەشی کردیت بۆ خێزانەکەی ئێمە بیرەوەریەکی زۆر گرنگە. بەر لە ئێستا خێزانەکەی ئێمە بەم جۆرە خۆپارێز و باوەڕدار نەبووین، هەر کەس بەو جۆرەی دەیویست لەژیانی

خۆیدا دەژیا. کتێبی (ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت) سەرەتا هاوسەرەکەم خوێندیەوە، دواتر زۆر بەتامەزرۆییەوە پێشنیازی بۆکردم کە بیخوێنمەوە. لەپاش منیش خەندە خوێندیەوە، زۆر شکور و سوپاس، ئەم کتێبە بچوکە ئێمەی بەرەو ڕاستەقینەکانی ئیمان و پەیامەکانی نوور برد. بەمانایەکی دیکە ئیمانمانی ڕزگارکردو بووە هۆکاری گەڕانەوەمان. دایکم لێرەدا هاتە قسە و وتی: مامۆستا... پەیامەکانی نوور زۆر جوانە، کاتێك دەیخوێنمەوە زۆر چێژی لێ دەبینم، زۆریش سودیان لێ وەردەگرم، بەڵام لەهەندێ لەوشەکانی تێناگەم، دەبێ چی بکەم؟

– فەریدەخان.. پەیامەکانی نوور تەفسیری قورئانە، لەگەڵ ئەوەشدا کتێبێکە لە عیلم و بیرکردنەوەو بەندایەتی، بێگومان وەك چیرۆکێك یان ڕۆمانێك نییە. هەر بۆیە بۆ گەیشتن بە ناوەڕۆك و مانا قوڵەکانی کەمێك ڕەنج و تەقەلا و ئارام گرتنی پێویستە. بەرەکەتە گەورەکان و دەرسە پڕپەندەکان دوای کۆششی سەخت و زۆر بەدەست دێن. پەیامەکانی نوور هەوڵی زۆری دەوێت. بەداخەوە بەهۆی شێوان و گۆڕانی زمانەکەمانەوە، ڕەنگە نەتوانین لەکتێبێك کە پێش ٢٠–٣٠ ساڵ نووسراوە باش تێبگەین. ئەگەر ٢٠–٣٠ پەڕەی پەیامەکانی نوور لەگەڵ فەرهەنگدا بخوێنیتەوە ئەم کێشەیە تێ دەپەڕێنیت، ئەوکاتە وشەیەك نامێنێت کە تێی نەگەیت. ئەمڕۆ پەیامەکانی نوور بۆ زۆر زمان وەرگێڕدراون، بە ملیۆنان خەڵك دەیخوێننەوە، بەم جۆرە هەزاران کەس ئیسلامییان هەڵبژاردووە.

## میوانێکی بانگهێشت نەکراو

لەوکاتەی قسەکردنێکی خۆشمان لەبارەی پەیامەکانی نوور دەست پێ کردبوو، دیسان زەنگی دەرگا لێ درا. ئەم جارە میوانەکە دراوسێکەی تەنیشتمان بوو.. خانم و هاوسەرەکەی. ئەو پیاوە کەسێك بوو کە تەواو وەك باوکم بیری دەکردەوە. بەجۆرێك لەڕێگا تاریکەکانی ژیان ڕزگاری نەبووبوو، هەر پارەیەکی دەست بکەوتایە دەیدا بە مەی خواردنەوە، لەبەرئەوەبوو تەمەنی گەیشتبوە شەستەکان و هێشتا لەخانووی کرێدا دەژیا. ئاخر بڵێ لەو کاتەدا کە گفتوگۆیەکی ئاوا خۆش‌و جوانمان دەست پێ کردبوو کاتی هاتن بوو؟!.. دەڵێن لە هەر شتێکدا خێرێك هەیە، با چاوەڕێ بکەین و ببینین. ئەو پیاوە سەرەتای قسەکانی بەم وشانە دەستپێکرد. -(حاشا) خوای گەورەی بە نادادپەروەر باس کردو قەدەری بە خراپ نووسراو دەزانی-، دەیوت:مەلاکان هاوار دەکەن: خوا هەیە! خوا هەیە... دەی لە کوێیە؟ چۆنە؟ لەکێ دەچێت؟ ئەگەر هەیە ئەو کێ دروستی کردووە؟ ئاوڕی دایەوە لای باوکم تاکو ئەویش پشتگیری لێ بکات و وتی: وانیە کاکە؟باوکیشم سەری ڕەزامەندی بۆ قسەکەی لەقاند، لەو کاتەدا بایەکی سارد لەژوورەکەدا هەڵی کرد و ئەم پرسیارە مێشك تێکدەرانە گفتوگۆ شیرینەکانی ئەوێی نەهێشت. لەڕاستیدا بۆ دەست کەوتنی وەڵامی ئەو پرسیارانەی ئەقڵی منیشیان تێکدابوو سەیری چاوی مامۆستام کرد، مامۆستا توران دوای یەك دوو کۆکە... بەنەرمی و بەهێمنییەوە هاتە ناو قسەکانەوە.

## گفتوگۆیەکی زۆر خۆش..

مامۆستا وتی:

مامـە.. ئەگـەر ڕێـم پـێ بـدەیت دەمـەوێت چـەند قسـەیەك لەسـەر پرسیارەکانت بکـەم. ئێـوە یـان مـەراقی ئەوەتانـە ئـەم باسـە بـزانن، یـان هەست بەم شتانە ناکەن کە دەیڵێن!

– فەرموو .. تاکو ئەمڕۆ قسەی زۆرم بیستووە، زۆر گوێم بۆ کەسانی وەك تۆ گرتووە، بەڵام هیچ نەچووە بەمێشکمدا. تۆش چەند قسەیەك بکە. بزانم، هەرچەندە هیچیش وەرناگرم...

– مامـە.. ئـەم جیهانـە بـێ سـەرەوبەرە نییـە.. پـەتی ئـەم گەردوونـە بەدەستی خاوەن دەسەڵات و هێزێکی گەورەوەیە، هـەر کەسێك خـاوەنی ئاوەزو ژیری بێت، کاتێك سـەیری دەوروبـەری دەکـات لـەم ڕاسـتیە حـاڵی دەبێت. سەیری مرۆڤ بکەن! لە سـەرەتاوە دڵۆپێـك ئـاوە، کـە کـاتی هـات دەبێتە قەتماغەیەك خوێن. پاشان ئەو دڵۆپـە ئـاوە دەبێتـە ئێسـقان.. کـە کاتی گەیشت دەبێتە کۆرپەیەك و دێتە دنیاوە کە خاوەنی چەند هەست و ئەندامێکی گرنگە، چاوانێك کە دەبینن، گوێکـان کـە دەبیسـتن، لـووت کـە بۆن دەکات، دەستێك کە دەتوانێت شت بگرێ، قاچێك کـە دەڕوات، دڵێـك کە هەست دەکات و مێشکێك کە بیردەکاتەوە... وردە وردە تا ڕۆژێك دێت ئەو دڵۆپە ئاوە وای لێ دێت توانای گۆڕین و داهێنانی زۆر شتی دەبێت لەم جیهانەی کە تیایدا میوانە. ئەو سەیرو سەمەرانەی لەگەردوونـدا ڕوودەدەن شتانێکی دواهاتوو نـین کـە بتـوانین بیانـژمێرین. دەبینـین... هـەر شـتێك بەسیسـتەم و ڕێکخسـتنێکی جـوان بەڕێوەدەچـێت، لـە هـەر جوڵـەو چالاکیەکدا سـودو حیکمـەت بـەدی دەکرێـت، هـەموو شـتێك بـەپێوەرێکی

هەست بزوێن دروست بووە، هیچ شتێك لەخۆڕاو بێ هۆ نییە، باشە كێ ئەم هەموو كارو بەرهەمە هونەری و دەست ڕەنگینانە دروست دەكات؟ كێیە دروستكەری ئەم هەموو چالاكییانە؟! سوڕێنەری ئەستێرەكان بەبێ بەریەك كەوتنیان، بەدیهێنەری دنیا كە كردویەتیە لانكە بۆ هەموو زیندەوەران، كێیە كە لەكاتی خۆیدا ڕزق دەبەخشێتە ملیارەها زیندەوەر؟! كێیە ئەو دروستكەرەی كە لەتۆوێك كەهێندەی سەری دەرزیەكە، دارو درەختی زەبەلاح و، لەدڵۆپە ئاوێك مرۆڤێك بەدی دەهێنێت؟! كەسانێك دەڵێن (سروشت) كردی... هەندێكی تر بەجۆرێكی تر دەڵێن (هێزێك)، لەكاتێكدا بەوتەی ئەوانەی دەڵێن (سروشت كردی) ئەمە ناوێكە دەدرێت بە بوونەوەرە نازیندووەكان، ئەو بوونەوەرانەی كە نەئەقڵ و نەزانست و نە هەست و نە هێزیان نیە. لەكاتێكدا ڕوون و ئاشكرایە كە نازیندووەكان ناتوانن شتانێك بۆ خودی خۆشیان بكەن. وانیە؟ بەملیۆنەها ساڵ چەكوش و تەختەو بزمار لەژوورێكدا دابنێ، ئەگەر وەستایەكی بەئەزموون بەكاریان نەهێنێت تەنانەت مێزێكی بچووكیش دروست نابێت. بێگومان گەڵا و هەواو ئاوو تیشكی خۆر لەچەكوش و تەختە بەئاگاتر نین، كەوایە كلوە بەفرێك تەنانەت مێزێك تەواو و بێ كەم وكورتی ترە. كە بەم جۆرە بێت، كەوایە ئایا ڕوون و لەبەرچاو نیە كە سروشتێكی سادەی بێبەش لەهێز و ویست و نازیندوو و بێ هۆش توانای گیان كردنی بە بەر زیندەوەرێكی سادەو ساكاردا نییە؟! ماوەتەوە... یاساكانی سروشت كە بەڵگەن بۆ بوونی (الله)، چونكە ئەگەر یاسا هەبێت، دەبێت بەدیهێنەری هەبێت، هیچ یاسایەك لە خۆیەوە نایەتە بوون. تەنانەت لەو یاسایانەشدا كە مرۆڤ دایان دەنێت ئەمە بەڕوونی دیارە. جگە

لەوەش بۆ پیادەکردنی ئەو یاسایانە دادوەرێك پێویستە، ئەگەر دادوەر نەبێت هیچ یاسایەك لەخۆیەوە بڕیار بەسەر تاوانباردا نادات، جوانترین نموونەش بۆ ئەمە دیسان دەشێت لەکاروباری مرۆڤەکاندا ببینرێت، دەبێت ئەم پرسیارەش لەوانە بکەین کە بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە (سروشت) بەدیهێنەرە: گەردوون و یاساکانی سروشت کێ دروستی کردوون؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا بەناچاری دەڵێن (سروشت).. و دووەم پرسیار بکەین (مەبەست لە سروشت چییە؟) لەوەڵامدا دەڵێن (مەبەست لە گەردوون و یاساکانی سروشت)ە، ئیتر لەم کاتەدا سروشتیەکان بارێکی پێکەنین ئامێز دروست دەکەن، کە لاف ئەوە لێ دەدەن گەردوون خۆی لەخۆیەوە دروست بووە، بەڵێ.. بەڕاستی ئەمە پێکەنین ئامێزە، چونکە ئەمە جیاوازی نیە لەگەڵ ئەوەی بڵێین: (پەڕاوێکی نووسراو خۆی نووسەرەکەیە، دروستکەری مێزێك، مێزەکە خۆیەتی) کەسێك بەوردی سەیر بکات دەبینێت، بوونی سروشت بەو نەخش و نیگارە هەمە جۆرو ڕەنگاوڕەنگەیە کە یەکێکە لە کارە هونەری و سەرنجڕاکێشەکان، گەورەیی دروستکەرەکەی پیشان دەدات. ئەگەر لەسەرەوە وێنەی سروشت بگیرێت، تابلۆیەکی بێ هاوتایە، کە بەجۆرەها دروستکراو ڕڕبۆتەوەو بەزمانی حاڵ دەڵێت: (خاوەن و هونەرمەندی دروستکەری من خودایەکی خاوەن زانست و هێزو توانای بێ ئەندازەیە) بەم جۆرە ئەم ڕاستەقینەیە بە مۆسیقای ئاهەنگی گەردوون ڕادەگەیەنێت.

بێینە سەر باسی خودا، چۆن دروست بووەو لەچی دەچێت و وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە: پەروەردگاری بەدیهێنەری گەردوون و مرۆڤەکان، لەبەرئەوەی لەڕەگەزی دروستکراوەکانی نیە، ناکرێت و ناگونجێت بە دروستکراوەکانی بچوێنرێت.

کاتێك سەیری تابلۆیەك بکەین، بەژیرییەوە بڕیار دەدەین کە ئەو تابلۆیە کاری دەستی هونەرمەندێکە، و لە خۆوە نەکێشراوە، بەڵام ئەوەش دەزانین کە ناگونجێت ئەو هونەرمەندەی تابلۆکەی کێشاوە لەڕەگەزی فلچەو بۆیەو چوارچێوەکان بێت یان لەوان بچێت. ئەو دەست ڕەنگینەی تابلۆکەی کێشاوە بەگۆشت و ئێسقان و خوێن و ئەقڵ و ویستەکانیەوە بەتەواوی بونەوەرێکی جیاوازە، و هەرگیز و بەهیچ جۆرێك لەڕەگەزی تابلۆکە نیە و لەویش ناچێت. هەر بەو جۆرە بەدیهێنەری گەردوون و جیهانیش خوای پەروەردگار لەڕەگەزی گەردوون و بوونەوەر نییە، هەرگیز لەدروستکراوەکانی ناچێت، ئێمەش کەلەلایەن ئەوەوە دروست کراوین، بۆ ئەوەی لەبەدیهێنەرەکەمان بگەین، هەرچەندە هەوڵ بدەین و ئەو بە هەرشتێك بشوبهێنین دیسان شکست دەخۆین، هەر شتێك بەبیری ئێمەدا بێت دروستکراوی ئەوە. ئەو لە هیچ شتێك ناچێت، زیاتر بیرکردنەوە لە چۆنیەتی پەروەردگار لە مێشك و بیری مرۆڤدا ناتوانێت ڕوونکردنەوەیەك بدات؛ لەبەرئەوەی ئەقڵ و بیری مرۆڤ دروستکراوە هەر شتێك دروستکراوبێت ناتوانێت لەدروستکەرەکەی تێ بگات و بیری لێ بکاتەوە. بۆ نموونە سۆپایەك ئەگەر هۆشی هەبێت و، بە پێوەرەکانی خۆی هەوڵ بدات لەوەستاکەی تێبگات، بۆ تێگەیشتن هەوڵ دەدات وەستاکەی لەگەڵ خۆی و شتەکانی دەوروبەری بەراورد بکات. وای بۆ دەچێت وەستاکەشی

وەکو خۆی خەڵوز یان دار دەخوات و پاشان دەیکاتە دوکەڵ و خۆڵەمێش، سێ یان چوار قاچی هەیەو دەست و دەم و چاوی ڕەشن، بەم جۆرە بۆی دەچێت، و بێگومـان لەهـەر قەبڵاندنێکـدا هەڵـە دەکـات و لەوەسـتاکەی تێناگات. مرۆڤیش بۆ ناسینی بەدیهێنەرەکەی و بۆ وێناکردنی ئەو، بەهـەر شـتێك کـە دەیزانێـت و بەخەیاڵیـدا دێـت دەیپێوێـت، ئەمـەش بـێ سـەرئەنجامەو دووره لەڕاستیەوە.دراوسـێ پیرەکـەمان ئەگـەر گـوێی بـە قسـەکانیش نەدایـە، زۆر بـەوردی گـوێی بـۆ گرتبـوو، ئاشـکرابوو ئـەو ڕاستیانەی کە دەوتران ئەگەر کەمێکیش بوایە کاریگەری لەسـەری هـەبوو. من لە سەیرکردن و بەوردی و سەرنجەوە گوێ گرتنەکانی تێگەیشتم بـەڵام باوکم کەسێك نەبوو لەم قسانە تێ بگات.

## بۆچی قەدەرمان جوان نەنووسراوە؟

دراوسێکەمان هاتە ناو قسەکانەوە:

– بۆچی خودا ئەم ناڕەحەتیانەی داوە بەسەرماندا، باقەدەرێکی باشـی بۆ بنووسینایە، کاتێك قەدەرێکی خراپی بۆ ئێمـە نووسـیوە، تـاوانی ئێمـە چییە بەڕێز.

مامۆستا تـوران بەزەردەخەیـەکی بـەئازارەوە، بـە وتـە شـیرینەکانی دیسان هاتەوە ناو بابەتەکە:

– مامە گیان، لەبەرئەوەی بابەتی قەدەر بە هەڵـە تێگەیـەنراوین، بۆیـە لێکدانـەوەو ڕاڤـەی هەڵەشـی بـۆ دەکرێـت؟ ئـەوە زانـراوە، کـە هـەر پاشماوەیەك دەرئەنجامی یان کۆتـایی پلانێکـە، هـەر شـتێك بـە پێوەرێـك شێوە وەردەگرێت، مرۆڤیش هەروایە. گەورەیی چاو، درێژی زمان، سەنگی مێشك، ناسکی و نەرمی پشت و، شێوەی هـەموو ئەندامـەکانی تـر هـەموو

ئەمانە مل بۆ هێڵی سنورێکی نەبینراو دەدەن. هەموو ئەو گەردیلانەی لەشمان کە ئەرکیان پێ سپێردراوە هێزێك هەیە لەسنورێکی دیاریکراودا ڕایگرتوون، لەم ئیشەشدا ئێمە ڕۆڵمان نیە. کۆمەڵەی زانیاریە بۆماوەییەکانمان ئێمە دامان نەناوە، ئێمە زانیاریەکانی ژێنەتیکمان نەخوێندوەتەوەو بەپێی ئەو پلانەش لاشەمان بنیاد نەناوە. ئەمانە دەرئەنجامی قودرەت و زانست و تواناو ویستێکی بێ سنوورە. باشە ئەم سیفەتانە شیاوی کێن؟ بێگومان لە (الله) زیاتر بیرکردنەوە لەهەر شتێکی تر نەگونجاوە، کەوایە پلان داڕێژەرو دروستکەریش هەر ئەوە.. پەروەردگار، هەر لە لەدایك بوونمانەوە تاکو مردنمان؟ چی هەڵدەبژێرین و چیمان دەوێت و چۆن ئارەزوو دەکەین بژین و چی لەناخماندا هەیەو چۆن ویستەکانمان بەکاردەهێنین، هەموو ئەمانە بەزانیاری نەبڕاوەی خۆی پێش لەدایك بوونمان دەیانزانێت و بەگوێرەی ئەم ویستانەی خۆمان قەدەرمان دەنووسێت، واتە بەپێی ویست و هەڵبژاردنەکانی خۆمان، خوای پەروەردگارمان لەسەرەتاوە قەدەری ئێمەی نووسیوە، خوای گەورە دەزانێت هەرکەسێك چی دەکات، هەر ئەویش ویستی دروست کردووە، و ئازادی ویستەکانی داوەتە دەست مرۆڤەکان خۆیان، کاتێك قەدەری نووسیوین زانیویەتی ئێمە چی هەڵدەبژێرین. بەگوێرەی ئەوە نووسیویەتی، بۆ (زانینەکە)شی بابیر لە پیاوێك بکەینەوە کە لەسەر لوتکەی شاخێك وەستاوەو تەماشای هێڵی شەمەندەفەرێك دەکات، دەبینێت لەلای ڕاست و لەلای چەپەوە دوو شەمەندەفەر لەسەر هەمان هێڵ بەرەو ڕووی یەك دێن، بەڵام لەبەر بەربەستەکانی نێوانیان یەکتر نابینن. ئەو کەسەی سەر شاخەکە بەیەکدادانی ئەو دووانە لەسەرەتاوە

دەزانێت، ئەگەر پسپۆڕی ژمێریاری بێت دەتوانێت حسابی بکات و بینووسێت کەی و لەکوێ لەیەك دەدەن. ئەگەر ئەو پیاوە لەکات و شوێنی بەیەکداکێشانی ئەو دوو شەمەندەفەرەدا بچێتە لایان و پێیان بڵێت: (من لەسەرەتاوە دەمزانی و نووسیبووم کەی و لەکوێ لەیەك دەدەن) ئەوانەی ناو شەمەندەفەرەکە دەتوانن بڵێن: "ئەگەر تۆ لەسەرەتاوە نەتنووسیایە ئەوا ئەم بەیەکداکێشانە نەدەبوو!"...پرسیارەکە بەجۆرێکی تر بکەین: لەبەر زانینی بەیەکداکێشانی شەمەندەفەرەکان بوو کە بەیەکیاندا دا؟!

وەڵام: "لەبەر زانینی ئەو نەبوو کە بەیەکیاندا بەڵکو لەبەر بەرەو ڕووی یەك ڕۆیشتنیان لەسەر یەك هێڵ بوو، کە ئەویش زانی"، بەڵێ زانینی خوداش لەمە دەچێت. مرۆڤ کاتێك گوناه دەکات لەبەر ئەوەنییە کە گوناهەکانی لەقەدەریدا نووسراوە. لەبنەڕەتدا ئەو ناشزانێت چی لەقەدەریدا نووسراوە (بێ ئاگایە لەقەدەری خۆی). هیچ کەسێك "دەفتەری قەدەر"ی نەخوێندوەتەوە. لەبەرئەوەیە کەسێك کە بەئازادی و ویستی خۆی حەرامێك هەڵدەبژێرێت، تاوانەکەی دەخاتە ئەستۆی قەدەر، لەڕاستیدا ئیمان بەقەدەر، گەورەترین سەرچاوەی دڵئارامی و ئاسودەییە. باوەڕبوون و خۆدانە دەست قەدەر. خەم و ئەندێشەو بێ چارەییەکان کەم و سووك دەکات. قەدەر، ئامێزو پەناگەی ئیمانە، قەڵاو پارێزگاریەتی، ئەو بەندەری ڕۆحە بە ئازارەکانە، چارەسەری ئەو ناڕەحەتیانەیە کە بەسەرماندا دێن، ڕەحمەت و میهرەبانیەکانی خوداش لەنێوان دێڕەکانی چارەنووسماندا شاراوەن. بەندەیەك کە ئیمان و باوەڕی بەقەدەر هەبێت دەڵێت: "زاتێك هەیە کە شارەزاو زانایە بەمن و، بەمیهرەبانیەکەی نیعمەت دەدات"، بەم جۆرە بیردەکاتەوە. بارە

قورسەکانی ژیان سووك دەکات، مەشخەڵەکانی ئومێدی بیرو ئاسۆ دادەگیرسێنێت. لەبەرئەوە قەبر، ئامێزێکی میهرەبانیە، مردنیش کۆتایی تاقیکردنەوەی دنیای پڕ ناڕەحەتیە، دەنگێکە کە بانگەشەی کرانەوەی دەرگای خۆشی هەمیشەیی دەکات. قەدەر بەخششێکی خودایە بۆ مرۆڤەکان. ئەگەر قەدەر نەبوایە، مرۆڤ وازی لە خۆدانە دەست تەوەکول دەهێناو دەکەوتە هەڵەشەیی‌و یاخیبوونەوە. ئەمەش ژیانی دەگۆڕی بە پەژارەو پەرتەوازەیی، کەوابێت قەدەر تۆمەتبار نییە، بەڵکو ئازادییەکی خۆش و شیرینە لەبەندایەتیدا. ئەگەر مرۆڤ ئەمە نەزانیت، وەك گورگ دنیای دەکاتە شوێنی ناڕەحەتیەکان و دادەڕوخێت. ئەو گفتوگۆیەی کە تا درەنگان خایاندی هەمووان زۆر لێی سوودمەندبوون.

دراوسێ پیرەکەمان کاتێ هەستایە سەر پێ بۆ یەکەمین جار ئەو زەردەخەنە شیرینەم لەڕوویدا بینی، کاتێك دەستی بۆ مامۆستا توران ڕادەکێشا پرسی:

– مامۆستا، ئێوە ئیمامی چ مزگەوتێکن؟

مامۆستا توران وەڵامی دایەوە:

– من مامۆستای ئەدەبیاتم لە ئامادەیی.

دراوسێکەمان سەری لەقاندو وتی:

– زۆر حەیف... زۆر حەیف... دەبوو ئێمە ئەمانەمان لە تەمەنی گەنجیماندا ببیستایە، درەنگ کەوتین زۆر درەنگ کەوتین. لەو کاتەدا چاوم کەوتە سەر باوکم، بینیم دایکیشم لەباوکم دەڕوانێت، بەڵام لە باوکمدا هیچ نیشانەیەکی سودمەندبوون نەدەبینرا. ئای خودایە... بۆچی ئەقڵ‌و دڵی لەبەرامبەر ئەو ڕاستیانە داخراوە! کەوتبووە حاڵێکەوە کە هیچی

نەدەبیست خەمم بۆ دەخـوارد... زۆریـش.. خـوا نەخواسـتە بـاوکم ئەگـەر بـەبێ ئیمـانی بـڕوات و؟! ژیـانی هەمیشـەیی لـەناو بـەرێت؟! تەنانـەت بیرکردنەوەش لەمانە منی دەترساند.

کاتێ میوانەکانم بەڕێ کرد ناخم زۆر ئارام بوو، لەوانەیە یەکـەم جـار بووبێت کە هەستم بە ئاسودەیی کردبێت. خەندەش، لە هەر فرسەتێکی دا بەسـەیرکردنەکانی بـەردەوام بـوو لـە چـاودێری کردنـی مـن... بـەجۆرێك نەیدەویست لەبێزاربوونی من تێبگات...



# بەشی نۆیەم

## گیانسپاردنی باوکم

### پوختەی ئەم بەشە:

باوکم بەهۆی هەڵە زۆرەکانی هەم خۆی و هەم ئێمەشی ڕووخاندبوو، لەکاتی گیانسپاردنیدا تابلۆیەکی پڕ لەترس و سامناکمان بینی. باوکم لەنزیکی لێواری مەرگدا بوو، چ جۆرە مەرگێك ...ئەی خودایە..

## باوکم لەناکاو حاڵی خراپ بوو

زەحمەتەکانی دایکم بۆ باوکم و خوشکەکەم و کارکردن، ڕاکردنی من لەنێوان خوێندن و فرۆشگای خوێندنگەدا خەریك بوو بەڕێوە دەچوو، گەشتبوومە کۆتایی (ئامادەیی)، خەونی خوێندنێکی باش لە زانکۆ لەخەیاڵمدا بوو، بەڵام چۆن؟ بەکام پارە؟ و بەیارمەتی کێ؟

بەجۆرێك خۆم بۆ نەدەگیرا لەبیرکردنەوە لەو دراما بەئازارانەی باوکم و خوشکەکەم، دایکیشم کە بەتەواوی گەشتبووە خاڵی تەواوبوون، چۆن دەمتوانی خۆم بۆ خوێندنگەو زانکۆ ئامادە بکەم!

هەموو شتەکان لەمێشکمدا شپرزەو پەرتەوازەو تێکەڵ بوون، سەرەڕای ئەمانەش وابەستەییە زۆرەکەی خەندەشی هاتبووە سەر. لەڕۆژەکانی کۆتاییدا (بانو)ش دەرکەوت. بانو کچی پیاوێکی بازرگانی زۆر دەوڵەمەند بوو، کچێکی باڵا بەرز و جوان بوو، بەڵام فەلسەفەی ژیانی تا بڵێی نارێك و پێك و پەرتەوازە بوو، کچێکی ئیمان لاواز بوو، واتە کاروباری خێزانی و دنیا بینیمان تا بڵێی دژ بەیەك بوون، سەرەڕای هەموو ئەمانە وابەستەییەکی زۆری بەرامبەرم هەبوو، لەهەر دەرفەتێکدا دەیویست بمبینێ و قسەم لەگەڵ بکات، منیش وەك ئەوەی لەگەڵ خەندە دەمکرد، لەگەڵ ئەویش خۆم بەدوور دەگرت، چونکە بۆ من جگە لەوەی ئەم جۆرە شتانە زوو بوو، بەڵکو بارێکی دەروونی واشم نەبوو کە هەستەکانم کۆبکەمەوەو بیر لەم شتانە بکەمەوە. بەڵام بێگومان ئەگەر چاوم بە هەستەکانمدا بخشاندایە (خەندە)یان پەسەند دەکرد. خەندە کچێکی داپۆشراو و بەڕەوشت و ئاقڵ و دیندار بوو. بەڵام بیری دەوڵەمەندی (بانو)ش کەلەوانەیە چارەبێت بۆ نەبوونی و هەژاریم بەناخ و مێشکمدا

دەهـات. واتــە هەرچـەندە لـەم دوو کچـە خـۆم دوور بگرتایـە لەناخمـدا کێبڕکێیەکی شاراوە دەستی پـێ دەکرد. بـەڵام لـەو کاتـەدا کـە کارەکـان هێواش هێواش لەسەر ڕێی خۆیان دەڕۆیشتن، ڕووبەڕووی ڕووداوێکی سەیر بووینەوە.

باوکم جگـەری لەکارکـەوتبوو، لەمێـژبوو بـاوکم ئـەم نەخۆشـییەی هـەبوو، بـەڵام بەهەنـدی وەرنــەگرت وەك چـۆن دنیـای لا گـرنگ نـەبوو تەنانـەت تەندروستی خۆشی لەلا گرنگ نەبوو. ماڵی ئاوابێت خانمی پزیشك، دیسـان هاتە فریامان، بردمان و هێنامـان، بـەڵام سـەرئەنجام زۆر ڕوون بـوو مـن و دایکیشـم دەمـانزانی.. کـە بـاوکم کـەمێك لەتەمـەنی مـابوو. لەگـەڵ دایکـم لەترسـێکی زۆردا بـووین. ئـەو هەرچـەندە نـەخۆش و ئیفلـیج بـوو، بـەڵام ئاسـودەییەکی گیـانیی هـەبوو لەناومانـدا. سـەرەڕای ئـەو هـەموو ڕووداوو نەخۆشـیانەی خـۆی چـاك نـەدەکردو، دووری ئـەو لـەخوا و پێغەمبـەرو، نەگەڕانەوەی بۆ ئیمان و باوەڕ، ئێمەی زۆر دەترساند.

## لەپشت سەری باوکمەوە سامناکیمان بینی

دایکم بەردەوام لەپشـت سـەریەوە تـەڵقینی دەدا بـۆ دیـن و ئیمـان‌و ڕۆژی دوایی، بەڵام ئەو هـیچ بـۆی گـرنگ نـەبوو، خودایـە ئەمـە چـی بـوو! باوکم سەرەڕای ئەوەی کە دەیزانی تەمەنی کەمێکی مـاوەو لـەمردن‌و گـۆڕ نزیك بووەتەوە، هێشتا تەوبەو ئیستغفاری نەدەکرد، نەدەگەڕایەوە بۆ لای خودا. هیچ بیرم ناچێتەوە، بەیانیەکی یەك شەممە بـوو، مـن و دایکـم ئـەو ڕۆژە لەماڵ بووین. باوکم کتوپڕ حاڵی تێکچوو، ویسـتمان خێـرا پـەیوەنـدی بە خانمی پزیشکەوە بکەین، بەڵام بۆمان نـەکرا، ئـیتر بـاوکم لەچـرکەکانی

کۆتاییدا بوو، گەیشتبووە کۆتایی ڕێگاکە، لەلایەك من و لەلایەکیش دایکم لەسەرسوڕمانێکی زۆردا بووین. دایکم قورئانی گرتەدەست و، منیش (جەوشەن)، هەردووکمان سورەتی (یس)مان کردبووەوە، دەمانویست بیخوێنینەوە، ئای خودایە! نەمن و نەدایکیشم سورەتی (یس)مان پێ نەدەخوێنرایەوە، وەك ئەوەی زمانمان گیرا بێت، قورگمان کلیلی لێدرابێت مێشکم خاو بووبوەوە، شتی وا نەدەبوو. زۆر جوان دەمانزانی، سەدان جار خوێندبوومانەوە، بەڵام ئێستا نەمان دەتوانی بیخوێنینەوە، وەك ئەوەی هێزێك ڕێگەی خوێندنی ئەو (سورەت)ەمان لێبگرێت. لەگەڵ دایکم چاومان بڕی بووە یەك، سەرمان سوڕمابوو باوکم لەساتەکانی کۆتاییدا بوو. تەنانەت چەند ئایەتێکیشی نەبوو بەنسیب. دایکم لەپشت سەری باوکمەوە خۆی چەماندەوە:

– پیاوەکە.. دەبیستی؟! شەهادەت بهێنە، شەهادەت بهێنە. من دەیڵێم و تۆش دووبارەی بکەرەوە، باوکم هیچی نەدەبیست، وەك ئەوەی گەیشتبێتە دنیایەکی تر. لەناکاو چاوی وەك بەردی خاڵ کردەوە، ئەوەندەی بۆ بکرێتەوە دەمی کرابووەوە، دەموچاوی تەواو سوور بووبووەوەو دەستی بەهاوار کردن کرد.

## دەرگاکە داخەن وا دێن!

– دەرگاکە داخە، مەهێڵە ئەوان بێنە ژوور، هاتوون من بکوژن، دایبخەن، من مەدەنە دەست ئەوان، وا هاتن، بیانوەستێنن ئەوانە.

دایکم لەلای سەریەوە بوو:

– پیاوەکە، کەسی لێ نیە، تۆ خەیاڵ دەکەی، لەژوورەکەدا تەنها ئەم دووانەمانی لێیە، ئەوەی من دەیڵێم دووبارەی بکەرەوە، شەهادەت

بهێنــە.باوکم هــیچ هــیچ دایکمــی نــەدەبینی، ئــەو بــەردەوام بــوو لــە هاوارکردنەی.

— مەهێڵە ئـەو دەمووچـاو ڕەشـە بێتـە ژوور، ئـەو چـەقۆیانەی دەستی نابینن؟ وادێن.. من دەکوژن، دەمبڕن، لەت لەتم دەکەن، ڕێگەیان لێبگرن واهاتن. سـێ کەسـن.. یـەکێکیان درێـژەو زۆر ڕەشـە، سـەیری چـاوەکانی بکەن ئاگر لەچاوی دێت، دەست بۆ من ڕادەکێشێت، منی دەوێـت، ئـەوانی تریش کەلوپەلەکانیان دەرهێنا، دەمکوژن، واهاتن مەهێڵن بێنەژوورەوە.

لەبەرامبەر ئەو دیمەنە ناخ سوتێن‌و پڕ لەپەند و سامناکەدا هـەر لـەو شوێنەی کە وەستابووم دانیشتم، مێشکم وەستا بـوو، شـۆك لێـی دابـووم. باوکم لەسەر نرکە نرك و هاوار هاوار و دایکیشم لەپشت سـەریەوە بـەوتنی شـەهادەت بـەردەوام بـوون، بـاوکم چـاوەکانی داچـەقا، ڕووخسـاری مـۆر هەڵگەڕا، بەخیزە خیزێکی سامناکەوە سەری کەوت بە لایەکدا وەك ئەوەی لەناو سـەدان کەسـدا خنکابێـت، لـەناو ئـارەقی خۆیدا مـابوو، دایکـم ئـەو کەفەی لەدەمی دەهات دەیسڕی. منیش لەوناوەدا خۆم ون کردبوو. دایکم چاوەکانی داخسـت و چـەناگەی کۆکردەوە، لەپشـت سـەریەوە دانیشـت، بەشــی (موناجــات)ی پەیامــەکانی نــووری بەســەردا خوێنــدەوە، منــیش لەبەرامبەر ئەو جۆرە ڕۆیشتنەی باوکمدا ئەبڵەق بوو بووم، لەڕاستیدا ناخم تەواو تەواو دەسوتا. مردنێکی زۆر سەیر و سامناك و زۆر پڕپەند بوو. وەك بڵێی خودا بیەوێت وردەکاری ئەو جۆرە مردنە سەیرە پیشانی ئێمە بدات.

## باوکمیان دفن کرد

لەبەردەمماندا کۆتاییەکی پڕ پەندی چیرۆکی تەمەنێکی شکۆداری و دەوڵەمەندی کە لەڕێگەی خراپدا بەفیڕۆ برابوو دەبینرا. ژیانێك کۆتایی هاتبوو، بەڵام چۆن؟! بەسوتاندنی خۆیو چواردەوریشی. ئەمە هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو، ئەمە نرخی هەم ماڵ و هەم کەسێتیو ڕێز، هەم ناوبانگ و، هەمیش ئیمان بوو. ئەم نرخە زۆر گران بوو، ئەو نرخەی کە ژیانی هەمیشەیشی لەناو برد، زۆر سامناك بوو، لەرزێنەربوو، ئەو پەندەی دایکم لەچوارچێوەی گرتبوو هەڵیواسیبوو هەموو ئەمانەی پوخت کردبوویەوە:

"ئەوەی خودا بدۆزێتەوە چی لەدەست دەچێت؟! ئەوەی خوای لەدەست بچێت چی دەدۆزێتەوە؟!، ئەگەریش بیدۆزێتەوە دەبێتە بەلا بۆی. " بەڵێ، ئەمە میراتی کەسێك بوو کە لەسەر حەرام و هەڵەو لەتاریکیدا ڕێگەی دەکرد، ئەمە بابەتێك بوو کە دەبوو باش بیری لێبکرێتەوەو زۆرباش بسەنگێنرێت.

باوکمیان دفن کرد، بەڵام ئازارەکانی دایکم زیاتر بوو، گومانی ڕۆشتنی باوکم بە بێ ئیمانی، دایکمی زۆر نیگەران کردبوو و زۆر دەگریا. هەموو ڕۆژێك دوای نوێژی بەیانی هەر جۆرێك بوایە سورە( یس) ی بۆ ڕۆحی باوکم دەخوێندەوە بەچەندین کاتژمێر نزای بۆ دەکردو بۆی دەگریا. دایکم ئیتر ماندوو بوو لە هاتوچۆی نێوان مەزاری گۆڕی باوکمو ژووری خوشکەکەم لەنەخۆشخانەو شوێنی کاری پاککردنەوەکەی. بوو بوو بەلاشەیەك کە نەیدەتوانی خۆی لەبەردەم ئازارەکانیدا بگرێت. ئەمە دڵی تەنگ دەکرد، هەناسەی توند دەکردو ئارەقی پێ دەڕشت. ئەمانە ئازارێك بوون کە بەرگە نەدەگیران.

# بەشی دەیەم

## خانمی پزیشك و دایكیشی گیانیانسپارد

### پوختەی ئەم بەشە:

ئەو هەواڵەی كە لەبارەی تەنها دۆستمان، تەنها یارمەتیدەرمان، تەنها كەسانێك كە لەدڵو ناخەوە ئێمەیان خۆش دەویست خانمی پزیشكو دایكی (بەتول خان)ەوە پێمان گەیشت، دنیای ئێمەی دیسان وێران كرد!! بۆچی هەموو كاتێك ئێمە دەكەوینە ژێر باری دەربازنەبوونەوە؟ حیكمەتی ئەمە چىیە؟

## نمایشی ئازارێکی تر

لەگەڵ دایکم بەتەنها مابووینەوە، خوێندنگەکەشم بەرەو تەواوبوون دەڕۆیشت.. خەریکی خۆئامادەکردن بووم بۆ تاقیکردنەوەی زانکۆ. لەگەڵ ئەوەیش کە دەمزانی خوێندن بۆ من زۆر سەخت دەبێت. تاقیکردنەوەکە ڕۆژی (١ شەممە) دەکرا، بەڵام ئەو هەواڵە ناخۆشە ڕۆژی هەینی پێمان گەیشت، واتە دوو ڕۆژ پێش تاقیکردنەوەکەم. ئەم هەواڵە بەئازارە، گەورەترین خۆڕاگری و ئارامی ژیانی ئێمەی ڕووخاند، کۆتایی گەورەترین ئومێدمان بوو. خانمی پزیشك و هاوسەرەکەی و دایکی لەکاتی ڕۆیشتنیان بۆ سەردانی خزمێکیان، بەیانی ڕۆژی هەینی تووشی ڕووداوی ئۆتۆمبیل ببوون، خانمی پزیشك و دایکی دەستبەجێ گیانیان لەدەست دابوو، هاوسەرەکەشی بەبریندابوونێکی سەختەوە گەیەندرابوە نەخۆشخانە.

ئای خوای گەورە.. ئای..

ئەقڵی بچووکی ئێمە تێناگات لە پلانەکانی تۆ، لەبەرئەوەی لە کارەکانی تۆ تێ ناگەین، لەسەرسوڕمانیەکەوە بۆ سەرسام بوونێکی تر، لە تێڕامانێکەوە بۆ تێرامانێکی تر، ڕاپێچ دەکرێین، ئەمە حیکمەتێکی چەند بچووکە؟ ئەمە نهێنیەکی چەند نەزانراوە؟

چوومە تاقیکردنەوەی زانکۆوە، تەنها ئەوەندە دەزانم کە دەستم کرد بە تاقیکردنەوەکە، دوای ئەوەش دیاربوو.. داڵغەم ڕۆشتبوو، کاتێك هۆشم بەخۆمدا هاتبوەوە تاقیکردنەوەکە کۆتایی هاتبوو.

دەمزانی خەیاڵی خوێندنی من دەکەوتە دەم ئاو... بەڵام چەندەش دەمویست بخوێنم... زۆرباش دەمزانی کە ئەوە پێویستییەکە نابێت وازی

لێ بهێنم. پێویست بوو بۆم تاکو نەکەومە بەرپێی کەس، تاکو لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم و خۆم خۆم بەڕێوە ببەم. نەبوو...نەبوو..

دوای ئەمە چی دەبوو؟ بەرلەوەی دەرفەت هەبێت بۆ بیرکردنەوە لەمە، دیسان لەگەڵ ڕووخانێکی تر، کەوتنێکی تر، سەرسامیەکی تر، ڕووبەڕوو دەبووینەوە، ئیتر بەجۆرێك ڕاهاتبووین، کە کارەساتێك کۆتایی دەهات یەکێکی تر دەستی پێ دەکرد، بەڵام هەر ڕووداوێك لە ژیانی من و دایکیشم کەلێنێکی پڕ نەکراوەی دروست دەکرد، دەبووە هۆکاری ئاگرێکی دانەمرکاوە.

## جارێکی تر ئاوارە بووینەوە

دوای ئەوەی خانمی پزیشك و دایکی بەڕەحمەت چوون، دوای ماوەیەکی کەم حاڵی هاوسەری خانمی پزیشك باش بووەوەو هات ئاگاداری کردین کە دەبێ ئەو ماڵە بەجێبهێڵین. بێگومان دەشمانزانی کە ئێمە بە پێداگری خانمی پزیشك بەڕەحمەت بێت لەو ماڵەدا مابوینەوە، ئەگینا هاوسەرەکەی ئێمەی نەدەویست. ئاه خانمی پزیشك.. جێگەت بەهەشت بێت. چاکەی تۆمان چۆن بیردەچێتەوە.. تۆ لە قورسترین و زەحمەترین ساتی ژیانماندا یارمەتی ئێمەت دا. خانمی پزیشك خاتوونێکی زۆر دیندارو فریشتەیەك بوو لەگەڵ ئەوەشدا لەساتی مردنیدا ڕووداوێکی پڕ پەند ڕوویداوە. ئۆتۆمبیلەکە هاوسەرەکەی لێی خوڕیوە، خۆی و دایکیشی لەپشتەوە دانیشتوون، لەبەرئەوەی ڕۆژی هەینی بووە، سەرقاڵی خوێندنی (جەوشەن) بوون، لەوکاتەدا بەهاوسەرەکەی وتووە:

– با ئەو پیاوە پیرەی لەسەر شەقامەکەیە هەڵگرین، سەیرکە دەستمان لێ ڕادەگرێت.

لەو کاتەدا هاوسەرەکەشی دەڵێت:

– من هیچ شتێك نابینم، کام پیاوی پیر؟

لەوکاتەدا تووشی ڕووداوەکە دەبن و هاوسەرەکەی لەگەڵ ئەوەی شۆفێر بووە شتێکی وای بەسەرنایەت، بەڵام ئەو دوو خانمەی لەدواوە (جەوشەن)دەخوێنن بەڕەحمەت دەچن، لەڕۆژێکی هەینیدا و لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا... ئەمەش مردنێکی چەندە شیرین و، چەندە پڕ پەند...! وەك ئەوەیە حەز بە مردنێکی وابکەیت، ئاوات بە مەرگێکی وا بخوازیت.. ئەی ئەو مردنە سامناکەی باوکم؟ مرۆڤ دەترسێنێت.

ئەوە سەرئەنجامی ئیمان و بێباوەڕییە.. سەیربکەن بەڕاستی دەبێت پەندێکی زۆر وەربگیرێت..لە گەڕەکێکی قەراغ شار، خانوویەکی بێ تاپۆ دوو ژوورمان دەست کەوت، دوای ئەوەی خوێندنگەم تەواو بوو، کارێکی بچووکم بۆ خۆم دۆزیەوە. دایکیشم جار جارە بەردەوام بوو لەسەر چوون بۆ کاری پاککردنەوە.

## خانمێکی سەرنجڕاکێش بە خوشکەکەمەوە پەیوەست بوو بوو..

کە ماڵ و گەڕەکەکەمان جێهێشت، وام بیرکردەوە کە خەندەو بانوش وازم لێدەهێنن و ئەوینەکەیان لەخوێندنگەدا جێدەمێنێت. بەڵام هەردووکیان دیاربوو نیەتی ئەوەیان نەبوو بەرۆکم بەربدەن. خەندە دیسان بەتێکەیشتوویی و ئەوینی خانمانەی دەیبینیم و هەواڵی دەپرسیم. بانووش هەموو ئیشی لەدەست دا، هەموو ڕۆژێك بێزاری دەکردم.

لەم ڕۆژانەدا بوو خانمێك لە نەخۆشخانە هۆگری خوشکەکەم بوو بوو، بەپەلە لە نەخۆشخانەوە بانگکراین، بەپەرۆشی و سەرسوڕمانەوە لەگەڵ دایکم ڕۆیشتین، پەرستیاری خزمەتگوزار پێشوازی لێکردین:

– کچەکەتان حاڵێکی بەسەردا هاتووە.

دایکیشم بەترسەوە پرسی:

– چی بووە؟

– نزیکەی هەفتەیەك دەبێت، کچەکەتان پەیوەندی لەگەڵ ئەم دنیایەدا نەماوە، لەگەڵ ئێمەدا قسە ناکات و ئەوەی دەیڵێین نایبیستێت، و هیچ کاردانەوەیەکی نییە بۆمان، بەڵام زۆر ڕێك و پێك و زۆر هۆشمەندانەو ئاقڵانە ڕەفتار دەکات. لەم ماوەیەی دواییدا تەنها لەگەڵ کچێکی گەنجدا کە دێتە ئێرە قسە دەکات.

دایکم بەپەرۆشەوە وتی:

– ئەی ئەو کچە گەنجە کێیە؟

– ئێمە نازانین، هەر جۆرێك بێت دەبێت ناسراوێکی خۆتان بێت! جارجار لەژوورەکەیدا دەیبینین، بەڵام ئەویش هیچ قسە لەگەڵ ئێمەدا ناکات، دیارە کە لەگەڵ کچەکەتان زۆر لێك تێدەگەن. پەرۆشی و سەرسوڕمانمان تا دەهات زیادی دەکرد، دایکم وتی:

– دەتوانن وەسفێکی ئەو کچەم بۆ بکەن؟

یەکێك لەو پەرستارانەی کە جارجار ئەو کچەی دیبوو وتی:

– خانمێکی داپۆشراوی پۆشاك سپییە، باڵای مامناوەندە و زۆر خانمێکی پاکو بێگەردو زۆر جوانە.

## ڕووداوێکی پڕ نهێنی

من و دایکم لەسەرسامیەکی زۆردا بوین، ئەم ڕووداوە وەکو مەتەڵ وابوو.. خوشکەکەم لەگەڵ کەس قسە ناکات، کاردانەوەشی نییە بۆ قسەکانی ئەوان، وەکو ئەوەی لەدنیایەکی تردا بێت، بەڵام لەگەڵ ئەو خانمە سپی پۆشە کە جارجار دێتە لای قسە دەکات ئەو خانمەش کەس نایناسێت!!

ئای خوایە، وادیار بوو کە دووبارە لەگەڵ ڕووداوێکی پڕ حیکمەت و پڕ پەنددا ڕووبەڕوودەبووینەوە.

– باشە کەس لەگەڵ ئەم خانمە، کە دێت و دەچێت قسەی نەکردووە؟

– یەکێك لەهاوڕێکان پرسیاری لێ کردووە، بەڵام ئەو وەك ئەوەی نەیبیستبێ وەڵامی نەداوەتەوە...

پەرستارێکی تریش:

– لەژوورەکەدا بوو، یەك دوو پرسیارم لێ کرد، کە ئاوڕم دایەوە دیارنەبوو. وتم دیارە ڕۆشتوەتەدەر چوومە سالۆنەکە، بەڵام نەبوو. خانمی پەرستارو ئەو هەواڵەی کە زیاتر سەرسامی دەکردین بۆ یەکەمجار دایکمی خۆشحاڵ و پەرۆش کرد:

– سەیرترین ڕووداویش ئەمەیە.. کچەکەتان دەستی کردووە بەنوێژکردن، هیچ کاتێکی بەفیڕۆ نادات، زۆر جوان خۆی دادەپۆشێت و نوێژ دەکات، بۆ ماوەی دوو ڕۆژە تەواو سەرنجی ڕاکێشاوین. زۆر سەرسامی کردووین:

- چۆن دەبێت؟...کچێك کە هەستەکانی لەدەستداوە ئەقڵی پەرتەوازە بووە.. هەموو کات نیازی خۆکوشتنی هەبوو، چۆن دەکرێت دەستی کردبێت بە نوێژکردن؟

- ئێمەش زۆر سەرمان سوڕماوە، بەجۆرێکیش بە (خشوعەوە) نوێژ دەکات، لە سەیرکردنیشی چێژ وەردەگرین، هەموو ئەمانە لەدوای هاتنی ئەو خانمەوە بۆ لای ڕوویدا.

بەڵێ زۆر سەیر و پڕ نهێنی و حیکمەت بوو، ئەمە نهێنیەك بوو. خوشکەکەم هیچ لەژیانیدا نوێژی نەکردووە، کچێك بوو کە هیچ کات لەگەڵ دیندارەکان نەبووەو پەیوەندیو نزیکی نەبووە لەگەڵ دیندا. چۆن دەکرێت دەستی کردبێت بەنوێژ؟ لەدنیای خۆیدا گەیشتبێت بە ئاسودەییو خۆشی! دڵنیام ..ئەمە جگە لە گریان و نزا بەکوڵەکانی دایکم هیچی تر نیە. خوای میهرەبان نزاکانی نەگەڕاندووەتەوە کە ناخی دایکم دەسوتا. ئەم ڕووداوە پڕ نهێنییانەی پیشاندایین.

## خوشکەکەم ئیتر لە دنیا دابڕابوو، هێنامانەماڵەوە:

خوشکەکەم لەماڵەوە بوو، بەڵام هۆشی لای خۆی نەبوو بەهیچ جوڵە و هەڵسوکەتێکی دەرەوە کاریگەر نەدەبوو. تەنها ئەو خواردنەی دەمانخستە بەردەستی کەمێکی دەخوارد و هەروەها پێویستی دەست شۆریشی بەجێ دەهێنا.

مامۆستا...خوشکەکەم ڕەفتاری سەرنجڕاکێشی تیادەبینرا، من و دایکم بەسەرسامیەوە سەیرمان دەکرد و چاودێریمان دەکرد، وەك ئەوەی لەلایەن دەستێکی زۆر ڕێکوپێکەوە کۆنترۆڵ بکرێت، چرکە بەچرکە بۆ کارەکانی ئاراستەدەکرا بەشێوەیەکی زۆر سەیر بەپەرستشەکانیەوە

پەیوەست بوو ، هەر چۆنێك بوایە زۆربەی کاتەکانی لەڕۆژدا لەسوجدەدا بوو. زۆربەی شەوانیش دەمانبینی لەسوجدەدا دەمایەوە. ئەوەندە خەماوی و پڕپەندو، کاریگەر بوو دەنگی پاڕانەوەو تۆبەو ئیستغفارەکانی هەر کاتێك سەیرمان دەکرد فرمێسکەکانمان بۆ ڕانەدەگیرا. خوشکەکەم وەك ئەوەی لەمندالّیەوە بەپەروەردەیەکی زۆر بەهێزی دینی و پڕ دیقەتەوە گەورە بووبێت، بەجۆرێکی وا ڕەفتاری دەکرد، هەموو شتێکی لەناخەوە بوو. لەبەرئەوە هەمیشە بیرم لەم بابەتە دەکردەوە: خوشکەکەم خەیالّێکی هەبوو، هەست و ویستە پاکەکانی خوشکەکەمیان بەبازرگانی کردو، پیسیان کرد، ئامانجی ئەوەنەبوو بکەوێتە ناو شتە پیسەکانەوە یان کات و ڕۆژەکانی بەسەر بەرێت، تەنها بەو خەیالّە کچانەو گەنجانەی خۆیەوە دەیویست نازناوێك بەدەست بهێنێت. بەجۆرێك کە بلّێ "منیش هەم!"و سەرنجی ئەوانی تر ڕابکێشێت، زۆر بەپاکیش بیری لەمە کردبووەوە. هەرگیز نەیدەویست لەبەرچاویەوە ناموس و کەسایەتی بشکێنن. بەلاّم بەجۆرێك تووشی شکستێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، هەموو خەیالّەکانی لەیەك کاتدا ڕووخا، بەجۆرێك خۆی بە تێکشکاوی دەبینیەوە، کە ئەمانە ئەویان پەرێشان دەکردو ئەم شەرمەزاریە ئەوی سوتاندو، کۆتایی پێهێنا. سەیری کەسی نەدەکردو تەنها مردنی بەڕزگاربوون دەزانی، ئەمە دەربڕینی نیەتی پاك و دروستی خوشکەکەم بوو، و خوداش لەبەر هەستە پاکو بێگەردە بەزۆر پیسکراوەکانی خوشکەکەم، لەوانەیە لەبەر تەمەنە پڕ ئازار ناڕەحەتی و گریاناویەکانی دایکم دەرگایەکی زۆر جیاوازی لەخوشکەکەم کردبێتەوە. بۆ ئەوەی لەو دنیا پیسەی ڕزگاری بکات، ئەوی لەگەلّ شەهیدەکان و کەسایەتییە پیرۆزەکان کردۆتە هاوڕێ،

ویستویەتی بەر لە مردنی لەو گوناهانەی پاك بێتەوە و ڕزگاری بێت. ئەم پەروەردگارە گەورەیە دەسەڵاتی بەسەر چیدا نیە، ئایا هەر یەکێك لە حیکمەتەکانی ئەو پڕ لە پەند و سەرسوڕهێنەر نین؟!

خەریکی نوێژی عیشابووین، لەگەڵ دایکم دەمکرد. خوشکەکەشم بەردەوام بوو لەنوێژکردن، زۆر بە پەند وەرگرتنەوە سەیرم دەکرد، بەجۆرێك لەسەر بەرماڵەکەی دەپاڕایەوەو لەگەڵ خوا قسەی دەکرد، ئەوەندە پەرێشان و لەناخەوە نزای دەکرد، دەستم کردە گریان بۆ ئەو ژیانە عارفانەی، بەجۆرێك لەهۆش خۆی چوو بوو، بەجۆرێك لە حضوری خوادا ون بووبوو، تاکو لەو نوێژەی تەواو بوو لەگەڵ دایکم فرمێسکمان ڕشت.

بەڵێ.. کەسێك هەبوو لەپشتیەوە. نەبینراو و هەست پێنەکراو، بەڵام بوونی تەواو ئاشکرابوو، ئەو کەسە هەم بەشێوەیەکی تەواو پڕ پەندو سەیر خوشکەکەمی ئاراستە دەکرد، هەم ئێمەشی سەرسام و پەرێشان کردبوو.

# بەشی یازدەیەم

## خوشکە تەواو گۆڕاوەکەم و خانمێکی پڕ نهێنی

**پوختەی ئەم بەشە:**

ئەو خانمە.. کێیە؟ چییە؟ لەکوێوە هاتووە؟ چۆن ڕێگا نیشانی خوشکەکەم دەدات و، ڕێنمایی دەکات، فریشتەیە یان هاوڕێییەکە. خودایە، تەواو سەرم سوڕما بوو ئەم خانمە کێیە؟

وەك ئەوەی ئەو خانمە نەناسراوە ململانێی من بكات:

لەگەڵ دایكمدا ڕووبەڕووی ڕووداوی زۆر سەیرو سەمەرە بووینەوە، ڕووداوی پڕ نهێنی! خوشكەكەم لەناكاو دەكەوتە قسەكردن، وەك بڵێی مامۆستایەك لەبەرامبەریدا وانەی پێ دەڵێت و، قسەكانی هەمیشە پڕ بوو لەتۆبەو پاڕانەوە، یەكێك لەو قسانەی كە لێمان دەبیست:

— تەواو وادەكەم.

بەجۆرێك بەسەرچاوو بەڕێزەوە وەڵامی دەدایەوە، كە قسەكانیشی تەواو دەكرد، ڕووی دەكردە قیبلەو چاوەكانی دادەخست، بەچەندین كاتژمێر لەسەر پاڕانەوەكانی بەردەوام دەبوو.

مامۆستا...خوشكەكەم وەك فریشتەی لێهاتبوو، وەك بڵێی پلەیەك لەمرۆڤی ئاسایی بەرزتر بوبێتەوە، ئەو ژیانێكی پاكترو جیاوازترو هێمنتر دەژیا، چونكە شیرینی ڕووخساری و جارجار زەردەخەنەكانی هیچ كەمیان نەدەكرد، كە خوشكەكەمان لەو ژینگە جیاوازەدا دەبینی لەگەڵ دایكم، هەم پەرۆش بووین، هەم خوشكم كەمێك دڵنەوایی بوو بۆمان، دوای ئەو ڕۆشتنە سامناكەی باوكم.

لە یەكێك لەو ڕۆژانە:

ئەو ماڵەی تیایدا دەژیاین دوو ژوور بوو كەمێكیش دووربوون لە یەكەوە، من لە ژوورێك دەخەوتم دایكم و خوشكەكەشم لەژوورەكەی تر، دایكم ئەو ڕۆژە زۆر نەخۆش بوو، تێكچوونی لێدانی دڵی و هەناسە توندیەكانی زیادی كردبوو، شەو بەئاگا هاتم، لەبەرئەوەی پەرۆشی دایكم بووم، چووم لەدەرگا نیوەكراوەكەوە سەیرێكم كرد، ئای خودایە چی ببینم مامۆستا؟

دایکـم ڕاکشـاوەو خـەوتووە، خوشـکەکەم لەسـەر بەرماڵەکەیـەتی، لەتەنیشتیەوە –لەم قسەیەم خۆش ببە– جوانترین و قەشەنگترین خـانمی دنیام بینی، باوەڕکە مامۆستا خانمەکەم بینی یان نا وەك ئـەوەی ئاگـام لەخۆم نەمابێ. پۆشاکێکی ئەوەندە جـوان و درەوشـاوەی لەبـەردابوو کـە هـەرگیز بـاس ناکرێت و ناوترێت مەگـەر ئـەوەی بەچـاوی خـۆت ببینـی، بەهێواشی لەسەر ئەژنۆ خۆم کرد بەژووردا، نەمدەویست هەستم پێ بکەن، بـــەردەوام شـــتێکی بـــۆ خوشـــکەکەم بـــاس دەکـــرد، ئـــەویش بـــە زەردەخەنەیەکەوە سـەیری دەکـردو وەلامـی دەدایـەوە، هەنـدێك جـاریش وەك مرۆڤێکی فەرمان پێکراو سەری بۆ دەلەقاند.

مامۆسـتا... ئـەو خانمـە لەماڵەکـەدا وەك گڵـۆپ هـەموو جێیـەکی ڕووناك کردبوویەوە، پاکیەکی تر، ڕوویەکی تری دروست کردبوو، لەوە زۆر دڵنیابووم کە ئەو خانمەی نێوانمان کەسێکی ئاسایی نەبوو، و هەر ئەم بوو کـە خوشـکەکەمی بـەو شـێوە ڕێکـە ڕێنمـایی دەکـرد، ئەوەشـی کـە پەرستارەکان لەنەخۆشخانە بینیبوویان هەر ئەم بووە. ئەوەنـدە پـەرۆش بـووم بۆئـەوەی بپرسـم، بـەلام نەمدەویسـت ئـەو ئەفسـونە نـەبینراوە تێکبدەم، دەترسام خۆشحاڵی خوشکەکەم تێکبدەم، دووبارە ڕۆیشـتمەوە ژوورەکـەم، زۆر بـەوردی کەوتمـە چـاودێری کردنـی دەرەوە، تـاکو ئـەو خانمـەی کـە لـەلای خوشـکەکەم بـوو ببیـنم کاتێـك دەڕوات، بـەردەوام چـاودێری دەرگـای دەرەوەم دەکـرد. چـەندین کاتـژمێری خایانـد، خـۆری بەیانی هەڵهات بەلام ئەو خانمە نەهاتە دەر.

دووبـارە وتم چـاوێك دەخشـێنمەوە بـەژووری خوشـکەکەمدا بـزانم هێشتاش لەوێیـە؟! بـەلام لـەوێ نـەمابوو.. ڕۆیشـتبوو. نـازانم لـەکوێوەو،

چۆن؟ بەڵام دڵنیابووم کە هەرگیز لەدەرگاکەوە دەرنەچووە، بەڵێ ئەو ئافرەتێکی نهێنی بوو، مرۆڤێکی نەناسراو، ئەو خانمێکی ڕێنیشاندەر بوو، ئیتر هیچ گومانم نەبوو، بەڵام پەرۆش بووم بۆ قووڵی ئەم بابەتە، دەمویست تێبگەم چۆنە.

## ئەوەی دەگوزەرا دایکیشم دیتبووی

نوێژی بەیانیمان کرد، ئەوەی ڕوویدا بوو بۆ دایکیشم باس کرد، دایکی نەخۆشم کە وامدەزانی ئاگای لەخۆی نییەو تابەیانی خەوتووە مەگەر دەکرا نەخەوتبێت!

– کوڕم ئەو ڕووداوانەی تۆ باسیان دەکەیت، منیش ئاگاداری بووم، ئەمە بۆ ئێمە نیعمەت و میهرەبانییەکی گەورەی خودایە، با ئەمە بۆ هیچ کەس باس نەکەین، با بەشاراوەیی بمێنێتەوە، ئەگەر ببیسترێت ئەم نیعمەتە دەبڕدرێت، کچەکەشمان ڕەنگە بگەڕێتەوە سەرباری پێشووی، ئەو ئێستا ژیانێکی بەهەشتیانە دەژی، ئەو لەگەڵ فریشتەکان و، حۆریەکان و، شەهیدەکاندا بووە بە هاوڕێ، چۆتە دنیای پڕ میهرو نووری ئەوانەوە، ئازارەکانی تەواو بوون لە نارەحەتییەکانی دنیا ڕزگاری بووە.

– کوڕەکەم ئەو خەونەی کە بینیمان بیرت دێت؟

ئێستا ئێمە لەو موژدانەیە دەژین کە ئەو دوو زاتە گەورەیە باسیان دەکرد، کە دەیانوت: خوا هیچ بەندەیەکی خۆی بێ چارە جێ ناهێڵێت، ئەوەندە بەسە کە ڕووی تێ بکا و، داوای لێ بکاو حاڵی خۆی بۆ بەیان بکات.

لە چاوەکانی دایکم فرمێسک دەتکا، نیشانەکانی پەند و سەرسوڕمان و شوکر و هێمنی و ئاسودەیی بەناو یەکدا تێکەڵ بوو بوون،

دایکم لەڕۆژەکانی دواییدا زۆر دەگریا.. وەك بڵێی ئەویش لەشێوەی خوشکەکەم بووەتە فریشتە. هەموو هەست و ویست و، خەیاڵەکانی ڕووی کردبووە خودا، خوی بەمانەوە گرتبوو، ڕووی کردبووە ڕەزامەندی خودا، چونکە ئەوەندە ناڕەحەتی، ئەوەندە ئازاری بەرگە نەگیراو ئەوەندە بارقورسی هەڵنەگیراو، وەك بڵێی دایکمی کوڵاندبوو، بوو بوو بەڕۆحێکی پاك و بێگەرد. لەلایەك دایکم، لەلاکەی تر خوشکەکەم.. منیش بێگانەیەك بووم کە دەمویست لەنێوان ئەواندا خۆم بگونجێنم. دایکم وەکو ئەوەی قسەیەکی شاراوەو زۆر نهێنیم پێ بڵێت ڕووی تێکردمو وتی:

– کوڕم، باقسەکانمان لەنێوان خۆماندا بمێنێتەوە، باشە؟

زۆر پەرێشان بووم:

– باشە دایکە... بەکەس ناڵێم.

لەناکاو دایکم لەلافاوی هەستێکی سەیر، فرمێسکەکانی چاوی کەوتنە سەرگۆناکانی، چەندە ویستی خۆی بگرێت نەیتوانی، لەکۆتاییدا تەقیەوە. زۆر بە پەرێشانیەوە پرسیم:

– دایکە خێرە إن شاء الله.. چی بووە؟

دایکم نەیدەتوانی هێوربێتەوە لە هەنسکەکانی، نەیدەتوانی ئەوەی دەیەوێت بیڵێت.

## ئەو ڕووداوە سەیرەی دایکمی گریاند

من دایکمم زۆر باش دەناسی، ئەو ئافرەتێکی زۆر ئارامگرو خۆڕاگر بوو، ڕووداوێك کە بەم جۆرە لەناخەوە بیگرێنێ و بیخاتە لافاوی هەستێکی سەیرەوە دەبێت ڕووداوێکی زۆر گرنگ بێت. لەڕاستیدا ڕووداوێکی واش بوو کە دایکمی بەو ڕادەیە گریاندبوو. دایکم وتی:

- کوڕم ئەوەی باسی دەکەم دوێنێ شەو بەسەرم هات واتە شەوی هەینی. تۆ خەوتی، خوشکەکەشت لەسەر بەرماڵەکەی نوێژی دەکرد، منیش (جەوشەن)م کردەوە، دەستم کرد بەخوێندنەوەی لەلایەکیشەوە کەوتمە خەیاڵی ئەو بارەی خوشکەکەتی تێدایە، حاڵی باوکت و، داهاتووی تۆ، ئەمانە لەبەرچاومدا دەهاتن و دەچوون، بۆ ئومێدێك دەگەڕام بۆ هاتنە دەرەوە. لەو کاتەدا نیوە خەوتوو نیوە بەئاگابووم، بەو (جەوشەن)ەی کە لە دەستمدا بوو خەریك بوو تەواو دەچوومە قولایی خەوەوە، لەگەڵ دەوروبەردا پەیوەندیم نەمابوو، بەڵام پاڕانەوەکانی ناو سوجدەی خوشکەکەت دەهاتە گوێم.

دیم دەرگاکە هێواش کرایەوە، ئافرەتێکی باڵا مامناوەندی بێ ئەندازە ڕێکپۆشی جوان، کە بەنیگاو پاکیەکانی بەقوڵی کاریگەری لە مرۆڤ دەکرد، هاتە ژوورەوە، لەکۆتاییدا ئەمە دەرکەوت. هەرچەندە خانمەکەم نەدەناسی بەڵام ئاشنا بووم بە کتێبەکەی دەستی. بەپەشۆکاویەوە هەستامە سەر پێ، لەو کاتەدا خوشکەکەشت هەستا هاتە تەنیشتم، بۆ یەکەمجار تێگەیشتم کە خوشکەکەت ئاگاداری ڕووداوەکانی دەوروبەری دەبوو، دەیبینی و دەیبیست، دیارە ئەمانەی دەبینی .

میوانەکەمان بەڕوویەکی خۆش‌و زۆر میهرەبانیەوە وتی:

- ئێوە لەناو ئارامگری و تەوەککول دان، پیرۆزبایتان لێ دەکەم، هەزار ماشاءالله، هەزار بارك الله!

ئەگەر بزانن ئەم ئارامگریەتان لەڕۆژی دواییدا چ نیعمەتێکتان پێ دەبەخشێ، ئەوکات دەتانبینی ئەم ناڕەحەتیانە زۆر کەمن. ئەمانە میهرەبانی خودان بۆ ئێوە، بۆ پێگەیشتنی میوەیەك بەتەواوی دەبێت

لەبەر گەرمی خۆردا بمێنێتەوە، چونکە "بەهەشت هەرزان نییەو بەرگەگرتنی دۆزەخیش لە توانای کەسدا نییە".

کچەکەت ڕزگاری بووە، ئەو لەگەڵ شەهید و ئەولیاکان بووە بە هاوڕێ و چووەتە دنیای ئەوانەوە، بەڵام زۆر دوعا بۆ هاوسەرەکەت بکە، ئومێد لەخودا نابڕدرێت، ئێوەم بە خوێندکاری خۆم پەسەند کردووە، دەتانخەمە ناو دوعاکانمەوە.

## کە هاتمەوە هۆش خۆم هیچ کەس لەژوورەکە نەبوو!!

سەرم سوڕما چی بڵێم، هیچم نەوت، هیچ شتێك لەو کاتەدا بەخەیاڵمدا نەدەهات... کە هاتمەوە هۆش خۆم هیچ کەس لەژوورەکەدا نەبوو، تەنها لەڕووخساری خوشکەکەتدا ئاسوودەیی‌و دڵخۆشیەکی زۆر هەبوو، کوڕەکەم، خوای گەورەمان وەڵامی هەموو ئەو پاڕانەوەو لاڵانەوەیەمانی دایەوە. ڕەنگە بەهۆی ڕووخانی ماڵ و موڵك و خێزانەکەمان، هێمنیمان تێکچوو بێ، بەڵام لەجێی هەموو ئەمانە دەرگای دەوڵەمەندیەکی هەمیشەیمان بۆ کرایەوە، ڕێگەی ئاسودەییەکی هەمیشەییمان پێ بەخشرا. چەندە سوپاس گوزاربین کەمە، هەموو تەمەنمان سەرمان لەسوجدە بەرزنەکەینەوە و سوپاسگوزار بین هێشتا کەمە.

ئای خودایە، ئەمانە چ شتانێکی پڕ پەندن... و چ هەواڵ گەلێکی جوانن.. یارەبی... چی دەبێت، ئێمە لای خۆت قبوڵ بفەرموو تاکو دەمرین ئێمە لەسەر ڕێگای ڕاستی خۆت و لەڕەزامەندی خۆت دوورمەخەرەوە.

# بەشی دوازدەیەم

## بانوی دەوڵەمەند؟ یان خەندەی دیندار؟

### پوختەی ئەم بەشە:

لەلایەك هاوڕێی گیانی و دیندار و پاکو بێگەرد (خەندە) و لەلایەکی ترەوە (بانو)ی دەوڵەمەندو بەشان و شەوکەت و کە دەیتوانی ئومێدی ڕزگاربوونمان بێت لە هەژاریەمان. لەنێوان یەکەمین هەڵبژاردندا سەرم لێ شێوا بوو، بەڵام کاتێك ئەو چیرۆکەم لە دایکمەوە بیست کە یەکەمین جار بوو بۆم باس بکات...

## لەنێوان هەردووکیاندا بێزار بووم

دوای کۆتایی هاتنی خوێندن، ژیانی کارم دەستی پێ کردبوو، کارێکی ئەوەندە گرنگیشم نەبوو. بەڵام دەموت کە دەمەوێت بیکەم، بەڵام بەجۆرێك نەمدەتوانی خۆم کۆبکەمەوەو خۆم بدەمە دەست کارو داهاتووم. دەبوایە هەڵبژاردنێك بکەم لەنێوان (خەندە) و (بانو) کە جار جار سەردانی ماڵمانیان دەکرد.

بێگومان بۆ هاوسەرگرییەکی کتوپڕ نا، بۆ ئەوەی ئومێدیان پێ نەدەم... چونکە لەڕووی باری دەروونی و ئابووریمەوە هاوسەرگیری بۆ من زۆر دوور بوو، سەرەڕای ئەوەش حاڵی خوشکەکەم بەو جۆرە بوو، دایکیشم تا دەهات نەخۆشییەکەی زیادی دەکرد، هیچیشم لەدەست نەدەهات. تواناشمان نەبوو، بۆ تەداوییەکی گرنگ، وەفاتی خانمی پزیشکیش ئەو دەستە یارمەتیەمانی بڕی. ئاخ.. لەبێ تواناییمان ئاخ..! چەندە دەمویست هەوڵی چارەسەری دایکم بدەم... هەموو ڕۆژێك دەستی دەخستە سەر دڵی و هێزی خۆی کۆدەکردەوە تاوەکو هەناسەیەك بدات. منیش کە هەستم بەمانە دەکرد، بەڵام هیچم لەدەست نەدەهات. خەندە دیسان میوانمان بوو، لەگەڵ دایکی هاتبوو، مامۆستا توران مرۆڤێکی زۆر بەڕێز و دڵسۆز بوو. ئەوان هەوڵی ئەوەیان نەدەدا کە من کچەکەیانم بەدڵ بێت، چونکە پێویستیشیان بەوە نەبوو. سەدەها گەنجی وەك من دەیتوانی زۆر شت بۆ کچێکی باشی وەك خەندە بکات، بەڵام ئامانجی ئەوان یارمەتیدان و دەست گرتنی ئێمە بوو، و من وەك کوڕی خۆیان بزانن و بمانپارێزن. بێگومان ئەو گرنگیەی خەندە بەمنی دەدا بابەتێکی تر بوو، لەبەرئەمە جارجار دەهاتە سەردانی دایکم. دوای ڕۆیشتنی ئەوان

بەکاتژمێرێك (بانوو) هـات. کەسێك بـوو لـەناو دەوڵەمەنـدی بـێ شـوماری باوکیدا گەورە بوو بوو. وای دەزانی کە هەموو شتێك بە پـارە دەکـڕدرێ و دەفرۆشـرێ، لەگـەڵ دایکـی و بـاوکی بـەئوتومبێلێکی مۆدێـل بـەرز لەبـەر دەرگامان دابەزین، مەبەستی بانوو بۆ ناساندنی دایك و باوکی بوو بەئێمـە، کاتێ بینیان لەبەردەم ماڵێکی دوو ژووری دا دادەبەزن دیار بـوو کـە تـەواو خەیاڵ شکاو بوون. دیار بـوو کـە دایکـی و بـاوکی بـەزۆری بـانو هـاتبوون. بێگومان دایکی و باوکی گوێیان بەو هەستەی بانویـان نـەدەدا کـە بـۆ مـن هـەیبوو، بـەڵام بۆنـەوەی زۆر لـەبانو نەکـەن، هاتبوونـە نـاو ئـەو یاریـە نەکراوەوە.

نەهاتنـە ماڵـەوە، لەبـەردەم ماڵـەوەدا لەگـەڵ مـن و دایکـم خۆیـان ناسـاند، بـەلێو جوڵانـدنێکی کـەم و هەسـتی دڵشـکاوییەوە سـوار ئۆتۆمبیلەکـەیان بوونـەوە، بـێ ئـەوەی هـیچ نزیکـی و ڕەفتـارێکی جـوان بنوێنن ڕۆیشتن. بەڵام بانوو ویسـتی نزیکییـەکی زۆر لەگـەڵ دایکـم پیشـان بدات بابەتەکە بەڕوونی دیاربوو، ڕێگای ئـەقڵیش یـەك دانـە بـوو، و هـەموو شتێك بەیان بوو. خەندە بەرامبەر هـەزارەها کچـی وەکـو بـانوو بـوو. ئـەو خاتوونێکی زۆر مرۆڤ دۆسـت بـوو. لەگـەڵ ئەوەشـدا کچـێکی زۆر دینـدار و بەڕەوشت و میهرەبـان. بـانووش گـوێی بـە دنیـا نـەدەدا، یـەکێك بـوو کـە هەموو شتی بەپارەو ناوبانگ دەزانی، پـێ لەسـەر زەوی دانانێـت و سـەری لـە ئاسماندایە، گونجـاو نـەبوو لەگەڵیـدا یـەك تەمـەن ژیـان ئەمـەش دوای ئەزمونێك. بەڵام وەرە ئـەو هەسـتە نـەوتراو و بەسـتراوانەی نـاخم بکـە بـە وشە. لەم نەداریەشدا بێزار نەدەبوو، دیاربوو دەردی دایکیشم هەر بۆ ئەمە بوو! ئەگەر لەگەڵ کچێکی ئـاوا دەوڵەمەنـددا هاوسـەرگیریم بکردایـە، لـەم

حاڵە یەك شەویەو لەم هەژاریە ڕزگارم دەبوو. باشە ئەی دڵخۆشیی ڕاستەقینە؟ ماڵ و سامان تەنها لایەنێکی بچووکی دەردەکەمان بوو. ئەی نەگونجانی باوەڕیو هەڵسوکەت چی؟ ئیتر لەنێوان ئەمانەدا سەرم لێ شێواو بوو، نەمدەزانی چی بکەم و، چۆن دەرباز بم!!

## چیرۆکە بە ئازارەکەی دایکم

دایکم لەبەرئەوەی دەیزانی خەریکم لەناو گلۆلەیەکی دژایەتیو بەربەرەکانێدا خل دەبمەوەو سەرم لێشێواوە ڕۆژێك منی لای خۆی دانیشاندو وتی:

– ئاگاداری هەموو شتێکم کوڕم، ئەمڕۆ ئێمە توانای هاوسەرگیری تۆمان نییە، إن شاء الله دوای کارێکی باشو هاتنەوەت لەسەربازی.. بەڵام بۆ ئومێد بەخشین بە کچەکان پێویستت بەهەڵبژاردنێکی باشو دروست هەیە. شتێکت بۆ باس دەکەم کە ڕەنگە بۆ تۆ سوودی هەبێت، باش گوێ بگرە. من باوکم زۆر هەژار بوو، بەڵام زۆر دیندارو پاك بوو، دایکیشم ئافرەتێکی زۆر دیندار بوو، لەبەرئەوەی تەنها کچی ئەو خێزانە بووم نازدار بووم، بەڵام هەژاریو نەداری ئەوەندە زۆری بۆ هێنابووین، و دوای خستبووین کە دەیان ویست بەهەر جۆرێك بێت دەبێت ببمە بوکی ماڵێکی دەوڵەمەند، بەجۆرێکی تر واتە هاوسەرگیری من لەگەڵ بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند دا هەم خۆمی ڕزگار دەکردو هەمیش ئەوان. خوازبێنیکارێکی زۆر دەهاتن، دەبوایە لەنێوان دواندا هەڵبژاردنم بکردایە، بێگومان ئەو کاتانە خێزانەکە بەناوی کچەکەیانەوە هەڵبژاردنی دەکرد، بەدەست کچەکە نەبوو، یەکێك لە خوازبێنیکارەکان بەڕەحمەت بێت باوکت بوو. تاکە کوڕی خێزانێکی دەوڵەمەند بوو. ئەوکاتیش هەڵسوکەتو خوڕەوشی زۆر تەواو

نەبوو، بەڵام ئەوەندەش بەبیانوو نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا باوکی جارجار مەی دەخواردەوەو ئەو کارانەی دەکرد، بەڵام وەك باوکت ماڵی جێ نەدەهێشت. خوازبێنیکارێکی تر خزمێکی دوورمان بوو، گەنجێکی بەڕەوشت و ڕێك و پێك و دینداربوو. بەڵام هەژار بوون، ماڵی خۆیان نەبوو لەکرێدا دەژیان. خۆشی لای دارتاشێك کاری دەکرد. من دڵم بە باوکتەوە نەبوو، ئەو ڕۆژانە چەندین جار نوێژی (إستخارە)م دەکردو دەنووستم. خەونی باشم بە باوکتەوە نەدەبینی، بەڵام ئەوانەی بەخزمەکەمانەوە دەمبینی زۆر جوان بوون. دایکی ڕەحمەتیم هەڵبژاردنی بۆ خۆم دانابوو، بەڵام نە دایکم و نەمنیش نەمانتوانی لە فەرمانی باوکم دەربچین، لەگەڵ باوکتدا بووینە هاوسەر، بێگومان لەهەر شتێکدا حیکمەتێك هەیە، بەڵام ئەمە دەرەنجامەکەیەتی... یەکەمجار بوو بەسەرهاتە بەئازارەکەی دایکم ببیستم، وەك کۆپیەك وابوو بۆ ئەو منی تیابووم، وەڵامێکی زۆر ڕوون بوو بۆ ئەوەی پێویستە چی بکەم. زۆر بە پەرۆشەوە لێم پرسی:

– ئەو خزمەتان چی بەسەرهات؟ لەگەڵ کێ بوونە هاوسەر؟ دەزانیت ئێستا چی دەکات؟ دایکم کەوتە قوڵیەکی زۆرەوەو ڕۆشت:

– دەکرێ نەزانم کورم! بێگومان دەزانم.

– ئێستا لە کوێیە؟

– بیرتە لە ڕۆژێکی باراناویدا یەکێك تۆی کردبووە تەکسیەکەیەوە، هێنایتیەوە ماڵ؟

– بەڵێ.

– دەی هەر ئەو پیاوە بوو.

بیرم هاتەوە، زۆرباش بیرم هاتەوە، بەدرێژای ڕێگا پرسیاری ماڵی لێکردم، بازرگانی کەلوپەلی دارتاشی بوو، پیاوێکی دەوڵەمەند دیاربوو.. وتی: هەرکاتێك تووشی زەحمەتێك بوون وەرە بۆلام، باوکت دۆستی منە، ئێستا تێدەگەم..زۆریش... ئای خوای گەورە ئای... ئەمانە چ ڕووداوگەلێکی سەیرن بەرزبوونەوەی کێ و کەوتنی کێ، دابەزینەوەی کێ و، گەیشتنە بەزریی کێ... لەدەستدانی کێ... هیچ کات دیار نییە لەهەر کاتێکدا ڕەنگە پاشقولێك بێت و لەهەر کاتێکیشدا ڕەنگە دەستگیرۆییەك...تاقیکردنەوەی ژیان دەبێت هەر ئەمە بێت.

## بڕیاری خۆم دابوو، بەڵام ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو

لۆژیك و ڕووداوەکانو ئەو بەسەرهاتە پڕ هەستەی دایکم بڕیارەکەمی لەمێشکمدا پێدابووم. لەگەڵ بانوو هەرگیز هاوسەرگیری ناکەم، لەرووکەشدا هەندێك سوودی دەبوو، بەلام کۆتاییەکەی بەدۆڕان دەبینرا...بەلام هەستەکانی ناوناخیشم بەتەواوەتی نەسڕی بوویەوە و فرێم نەدابوو. گونجاوترین بۆ من (خەندە)بوو. تەنها خەندە دەیتوانی لەم ژیانە پڕ نارەحەتیو ناخۆشیو کێشانەی من دا لەدڵەوە هاوکار بێت و، تەنها خەندە دەیتوانی بەهێزی باوەڕەکەیەوە ڕووبەڕووی ئەو ئازارانە بێتەوە.

بەڵێ...وتم (خەندە).. بڕیارەکەم جێگیر بوو. ئامادەبووم بەتەواوی ڕێگاکانم لەگەڵ بانوو جیابکەمەوە. بەلام پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا. ڕووداوێك کە هەمووشتێکی سەرەو ژوور کرد، بڕیارەکەمی سڕیەوەو لەسەرەتاوە گۆڕی. دیسان منی خستەوە ناو بێ چارەییو بێ دەربازبوونەوە. بانوو خێزانەکەی پلانێکیان بۆ من هەبوو، بانو

لەبەرئەوەی تەنها کچی ماڵ بوو ویستبویان لەگەڵ کەسێکی وەك من ببێتە هاوسەر کە بیخەنە ژێر ڕکێف و فرمانی خۆیانەوە، بەمانایەکی تر ویستبویان کڕیارێك بۆ کچەکەیان پەیدا بکەن، هەرچەندە بانوو ئاگاداری ئەمە نەبوو، بەڵام ئەمە پلانی باوك و دایکی بوو. گەنجێکی بێ کەس و بێ چارەو بێ دەسەڵات، کە گوێ بۆ فرمانەکانیان بگرێت و گەنجێك کە پەتەکەی لەدەستی ئەواندا بێت‌و بۆ هەر جێیەك بیانەوێت بینێرن، لەمە باشتر دەبوو؟! بۆ ئەمەش بێ ئەوەی لەمن بپرسن کەوتبوونە جوڵەو ئێوارەیەك هاتنە ماڵمان:

- دەی بابڕۆین

من و دایکم زۆر سەرمان سوڕما.

- ئەم ئێوارەیە قسەکە دەبڕێنینەوە، هەروەها ئەو ماڵەش کە بۆ ئێوەمان کڕیوە پیشانتان دەدەین.

بەتەواوی مانا گێژ بووم، وەك کرێکارێك کە بەپارە کار بکات‌و فەرمان بدات بەسەر خاوەنەکەیدا، بوون و مرۆڤێتی و هەست و هەڵبژاردنی تۆ گرنگ نین، ئەوان دەیانەوێت... ئیتر ئەمە بەسە. بەهەموو هێزمەوە پێداگریم کرد، بەرەو ڕوویان وەستام:

- ئەم کارە نابێت، لانی کەم بەڕێوەچوونەکەی زۆر بێ هەستانە و هەڵەبوو.

بەڵام باوکی بانوو پیاوێك بوو کە هەرگیز نابێت وشەی (نەخێر) ببیستێت. بۆ ئەو هەموو شتێك بەپارە دەکڕدرێت، هەموو ڕێگەیەك بەپارە دەگیرێتە بەر، هەموو کێشەیەك بەپارە چارەسەر دەکرێت. بێچارە مابوینەوە.. ئەمەش دەبێت حیکمەتێکی تێدابێت،

نهێنیەکی تێدابێت.. ڕۆیشتین... بێگومان بەبێ دایکم‌و خوشکەکەم بەتەنها خۆم..ئەو شەوە ئەڵقەش گۆڕدرایەوە، خانووە تازە کڕاوەکەمان بینی، هەموو شتێك لەژێر بڕیارو ویستی ئەو پیاوەدا بەڕێوە دەچێت، تەنانەت کاریشم ئامادەبوو، لەشوێنی کارەکەی ئەو پیاوە، بەڕێوەبەر هەرچی بویستایە ئەوەم دەکرد، سەلیقەو ژیانیان بۆ من هیچ گونجاو نەبوو، لەبەرئەوەی بەشداریم نەدەکرد لەخواردنەوەی ئەواندا هەربۆیە بۆیان بوو بووم بەبابەتی گاڵتەجاڕیان. مامەڵەی پیاوێکی زۆر بچووك و زۆر سادەم دەبینی. دوای سێ مانگی تریش ئاهەنگ دەگێڕدرا.

بەڵام زۆر دڵتەنگ بووم، بۆ ڕزگاربوون لەمە چی نەدەهات بەبیرمدا..!! بەڵام نیەتی ئەو پیاوە زۆر خراپ بوو، ئەمەی لەمنا هەست پێ کردبوو.

- ئەگەر هەڵەیەك بکەیت، بەژیانت قەرەبووی دەکەیتەوە.

ئەمە ڕوونترین (تهدید) بوو. چیم بکردایە خودایە؟! من ڕازی نیم، دایکم ڕازی نییە، بەڵام هاوسەرگیریەکی بەزۆر پەسەندکراو بوو.

## خێزانەکەی خەندە منیان زۆر شەمەزار کردبوو

کاتێك خەندە ئەم ڕووداوەی بیستبوو زۆر دڵتەنگ و نائومێد بوو بوو، بەڵام خێزانەکەیان دیسان هاتنەماڵمان، مامۆستا توران دووبارە بەمیهرەبانی‌و پاکی و دڵسۆزی خۆیەوە ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ هەر یارمەتیەك. دەیوت:

– مەترسن، بەتەنهانین، بێتاقەت مەبن و بڵێن کەسمان نیە، من بۆ سەلیم هەم مامۆستام، هەم باوکێکی مەعنەوی، هەر بەرپرسیارێتیەك بەناوی ئەوەوە دەگرمە ئەستۆ.

خەندەش زۆر بەماناو زۆر دڵتەنگ و دڵشکاو، بەڵام بەزۆر زەردەخەنەی دەکردو دوعای خێری لەبیر نەدەکرد. سەیری باشیی ئەم مرۆڤانە بکەن. لەم مرۆڤانە دووربکەویتەوە، و پشتگوێیان بخەیتو وەك کڕین و فرۆشتن ببینە زاوای مرۆڤ گەلێکی تر.. ئەمە بەبیرکردنەوەش لێی شێت دەبووم.. دەپووخام ڕزگارم بکە خودایە، ڕزگارم بکە ... لەم نەگبەتیو بەڵاو دڵتەنگییە ڕزگارم بکە.. ئاهەنگەکە دەکرا، بەڵام وەك ئەوە بوو بۆ مردن بچم، لەناوماڵێکی بێ چارەدا دوو نەخۆش بەجێ بهێڵم و بەرەو دنیایەکی قەشەنگ و ڕەنگاو ڕەنگ بچم کە ئاهەنگە، من تەنها مرۆڤێك بووم لەو قەرەباڵغیەدا کە ورەی بۆتە سفر. لەناو ئەو سەرگەرمی و ڕابواردنە شێتانانەی ئەواندا ئەوەی هاوسەرگیری دەکرد من بووم؟ یان یەکێکی تر؟ من ئەبووم بەزاوا یان خزمەتکار؟ تەنها شتێك کە دەمزانی ئەوە بوو، ئەو خێزانە دەوڵەمەندە منیان وەکو کڕین کڕیوە، بەو جۆرەی بیانەوێت ئاراستەم بکەن، فرمانەکانیان بەسەرمدا بدەن، دەبوو لەگەڵ ئارەزووەکانی ئەواندا بەردەوامی بەژیانم بدەم، ئەی دایکم و خوشکەکەم؟ دەی هەر ئەوان بوون ناخی منیان دەسوتاند..

فریشتەی فریشتەکان دایکم، تاکو من زیاتر دڵتەنگ نەبم بێ دەنگ دەبوو و، بەردەوام یارمەتی منی دەدا تاکو بیر لەڕووە جوانەکانی ئەم کارە بکەمەوە. بێگومان ئەگەر بەشێکیش بێت، ئەو ڕەزامەندی نواندنەی

من لەسەرەتاوە بۆ ئەم کارە تەنها لەبەر ڕزگارکردنی دایکم و خوشکەکەم بوو لەو هەژاری و نەداریە، تاکو بتوانن چارەسەرێکی باشیان بۆ بکەم.

## بووینە هاوسەر

جەستەم لە ڤێلایەکی زۆر بەرزدا بوو، لەدنیایەکی ڕەنگاو ڕەنگ و دەوڵەمەنددا کە تەنانەت بەخەیاڵیشمدا نەهاتبوو. بەڵام ڕۆح و بیرم لەناو ئەشکەنجەدا بوو. من جار جار دەگەڕامەوە ماڵەوەو پێویستیەکانی دایکم و خوشکەکەمم دابین دەکرد. بەڵام ئەمە ئاوا نەدەڕۆیشت، دوو کەسی نەخۆش بەتەنها لەماڵێکدا جێ نەدەهێڵران. ئەم باسەم بۆ هاوسەرەکەم کردەوەو وتم:

– دایکم و خوشکەکەم بەتەنها جێناهێڵم، دەبێت چارەیەك بۆ ئەمە بدۆزمەوە...

بەرلەوەی هاوسەرگیری بکەین هاوسەرەکەم دەیوت "دایکتو خوشکەکەت دەبەینە لای خۆمان"، بەڵام ئێستا خۆی ناکات بەخاوەنی ئەو قسەیە. بەم جۆرە ڕەزامەندی پیشان دا:

– بەباوکم دەڵێین، ئەو دەتوانێت چارەیەکی باشتر بدۆزێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرەکەم لەگەڵ دنیاو هەستی مندا، جیاواز بوو.

ئەو هاوسەرێکی بەشەهامەتی وەك خۆی دەویست، کە هاوڕێکانی کۆبکاتەوەو کەشێکی بەزر دروست بکات بۆ خۆدەرخستن و خۆگەورەکردن، هەموو پلانەکانی ڕۆژانەی وا دانابوو کە بڕواتە پیاسەکردن و ڕابواردن، لەبەرئەوە هەستێکی وای نەبوو کە لەغەم خواردنی من بۆ دایکم و خوشکەکەم تێبگات.

باوکیشی وتبوی:

– خزمەتکارێکیان بۆ دەگرین، هەر لەو جێیەی خۆیان دانیشن و، نەبنە بار بەسەر شانی ئێمەشەوە.

هەموو شتێك ئاشکرا بوو، سەرم سوڕما بوو، چی بکەم! دایکم پێی دەوتم:

– ئارام بگرە کوڕم، خوا هەر دەرگایەك دەکاتەوە، ئەوەی بەباشترین شێوە ڕووداوەکان لێکدەداتەوە (کاتە).

بەڵام پەتەکان ئەوەندە کرژبووبوون کە سەرەڕای ئەوەی تەنها ساڵێك بەسەر هاوسەرگیریماندا تێپەڕی بوو، بەڵام خەریك بوو کۆتایی ڕێگەکە دەبینرا.

لەم کاتەدا نەخۆشیەکانی دایکمو خوشکەکەم زیاتر بەرەو پێش دەچوون، پێویست بوو بۆ چرکەیەکیش بەجێیان نەهێڵم، ئەمە گەورەترین بابەت بوو کە هەمیشە لەگەڵ هاوسەرەکەم باسم دەکردەوە.



# بەشی سێزدەیەم

## وانەکەی مامۆستا توران

### پوختەی ئەم بەشە:

مامۆستا توران، جارێکی تر ئەقڵی ئێمەی شتەوە، دیسان دنیای ڕووخاو و بێزار و پەرتەوازەی منی پڕ کردەوە لە ڕووناکی. خەڵکی ئەم سەردەمە چەندە پێویستی بە میوانداری لەم جۆرە هەیە.

## له مامۆستا تورانەوە میوانـداریی گفتوگۆیـەکی بـەپێز کراین:

زۆرترین و تەنها میوان کە دەهاتە ماڵمان مامۆستا تـوران بـوو، ئـەو ئێوارەیە دیسان پێکەوە بـووین، لەگـەڵ منیشـدا وەك ئـەوەی هـیچ شـتێك ڕووی نەدابێت هەڵسـوکەوتیان دەکـرد و، خۆیـان کردبـووە خـاوەنی مـن و دایکم، ئەمە لەقوڵایی ناخەوە کاریگەری لەسـەرم هـەبوو. مامۆسـتا تـوران لەبەر ڕەزامەندی خـودا دەیویسـت یارمـەتیمان بـدات. لەگـەڵ تێپـەڕبوونی هـەر ڕۆژێکیشـدا دەمزانـی کـە خەنـدەی یەکـەم ئاشـنام ئەوەنـدە کچێکی تێگەیشتوو و ڕێکوپێکە، بۆ ئەمەش تەواو پەرێشان دەبووم.

مامۆسـتا تـوران ئـەو شـەوە دیسـان گفتوگۆیـەکی زۆر شـیرینی سازکردبوو، لە میوانداریەکەدا باسی ڕاستیەکانی نەفسی کردبـووەوە، لـەو کتێبەی (پەیامەکانی نوور) کە لە دەستیدا بوو، ئەو خاڵانەی کە بۆ ڕۆحـی من چارەسەر بوون ڕوونی دەکردەوە بەتەرزی شیرینی خۆی ناوەڕۆکی ئەو ڕاستیانەی کە چارەسەربوون بۆ کێشەکانی ئێمـە ڕاڤـەی دەکـرد. ئێمـەش لـەو هـەوا ئەفسـوناویە شـیرینەدا وەکـو ون بوومـان لێهـاتبوو، بـەڵام خوشـکەکەم هـیچ ئێمـە نابینێـت و بایـەخمان پـێ نـادات، ئـەو لەسـەر بەرماڵەکـەی خـۆی لـەناو دنیـای خۆیـدا ڕۆچـووبوو، لەگـەڵ خـوداداو لەئاسـودەییەکی زۆردا بـوو. ئـەو وانەیـەی مامۆسـتا تـوران لەسـەر (پەیامەکانی نوور) بۆ من زۆر گرنگ بوو، چونکە لەو گفتوگۆ جوانـەی کـە تێرم نـەدەخوارد دەمتـوانی سـود وەربگـرم، و هـەم ئـەو پرسـیارانەی کـە لەئەقڵمدا وەڵامم بۆ نەدەدۆزرایەوە دەمتوانی بپرسم. پێم وت:

- مامۆستا، زۆرێك لە خەڵك لەبارەی ئەركی بەندایەتییەكانەوە بیروڕایەكی لەم جۆرەیان هەیە: وەك ئەوەی بەندایەتی ئەركێكە تایبەتە بەپیرەكان، بۆیە بەم جۆرەیە تێڕوانینەیان دەڵێن: "دواتر بیری لێ دەكەینەوە، لەم تەمەنە گەنجیەماندا خۆمان بخەینە ژوورەوە، هیچ نەبێ با تەمەنمان بگاتە ٥٠-٦٠ ساڵی" ئێوە چی دەڵێن؟

مامۆستا بەزەردەخەنەیەكی شیرینەوەو بەم جۆرە چووە ناو بابەتەكەوە:

- مامۆستای بەڕێزم (محمد كركنج) لێكدانەوەیەكی جوانی هەیە، پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە: ئاشكرایە ئەگەر كەسێك بچێتە دوكانێك، بەهێندەی ئەو پارەیەی كە دەیداتە دوكاندارەكە دەتوانێت شت بكڕێت بە (پێنج هەزار) هەرگیز ناتوانرێت یان ناكرێت كەلوپەلێكی (دە هەزاری) بكڕدرێت ئەمە ناچێتە ئەقڵی هیچ كەسێكەوە، یان بەجۆرێكی تر بڵێین، چاوەڕێ ناكرێت، كەسێك كە خاوەنی (پێنج هەزار) بێت لەگەڵ كەسێك كە خاوەنی (دە هەزار) بێت هەردووكیان وەك یەك لەو دووكانە شت بكڕن. هەر بەم جۆرەشە، ڕێژەی قازانجمان لەڕۆژی دواییدا بەهێندەی ئەو بەندایەتیەمانە كە كردومانە، خەرج كردنی گرنگترین سەرمایەی تەمەنمان كە گەنجێتیە تەنها لەكاروباری دنیایدا و دانانی پیریمان بۆ بەندایەتی و ڕۆژی دوایی، جگە لە نەزانینی بازرگانی كردن هیچی تر نییە. تەنانەت لەكاروباری دنیاشدا هەر بەو جۆرەیە. كەسێك كە گەنجیەتی خۆی تەنها بەڕابواردن بەسەربەرێت و لەپیریدا دەست بداتە ئیش و كاری دنیایی، پێشبینی دەكەیت ئەو كەسە تا چەند سەركەوتووبێت: لەڕاستیدا دەوڵەتیش لەتەمەنی پێگەیشتوویی و گەنجیدا هاوڵاتیانی بۆ فەرمان

بـەرداری بـانگ دەکـات ، و لـە پـیری دا خانەنشـینیان دەکـات. نیـازی بەندایەتی کردنمان تەنها لە تەمـەنی پیریـدا مانـای ئەوەیـە کـە بازرگـانی ڕۆژی دواییمان زۆر بە سادە گرتووە. ئەو سـەرمایەیەی پـەروەردگار پێـی بەخشیوین بەسمانە هەم بۆ دنیا هەم بۆ ڕۆژی دوایی.

لەم خاڵەدا، لەپاڵ مرۆڤدا هەرکەسێك هەرجۆرە چەکێکی هەبێت هەر لە گۆچانەوە تا بۆمبی ئەتۆمی، دەتوانین لێکچووی ڕاوچییەکی بکەین.

هـەر یـەکێك لـەو چـەکانە جێیـەکی تایبـەت بـەخۆیان هەیـە، بـۆ بـەکارهێنانی. وەك چـۆن بـەکارهێنانی چـەکێك کـە خـۆی بـۆ ڕاوی شـێر بەکاردێت لـەڕاوکردنی کەروێشـکدا زیـان بـەخش دەبێـت، هـەر بـەو جـۆرە بەکارهێنانی موشەکێکیش کە دەدرێـت لەشـارێك لـەڕاوکردنی شـێردا زیـان بـەخش دەبێـت. ئێمـەش وەك ئـەو ڕاوچـییە، دەکرێـت ئێمـەش لـەجێی کەلوپەلی ڕاوکردن ئەوەنـدەی بتـوانین لەهـەر کـاتێکی تەمەنمانـدا لەسـەر کاروبـارە دنیـایی‌و قیامەتیـەکانمان بـەردەوام بـین بـۆ بەدەسـتهێنانی خۆشبەختی لەدنیا و قیامەت.

لەلایەکی ترەوە، کەسێك کە تەمەنی لاوێتی لەپێناو ڕەزامەندی خودا بەسەر بردبێت لەکۆتایی تەمەنیشیدا زیاتر ئارەزوو دەکـات لـەپێناو خـوادا کاربکات. هۆکاری ئەمەش وەکو پەرۆشی کۆتا چرکەکانی ناو تاقیکردنەوە یان نزیکبونەوەی کاتی داخستنی هۆڵی تاقیکردنەوە وایە، کەئاشکرایە لەم کاتانەدا زۆر نرخـی کـات بـەڕوونی دیـارە. خوێنـدکارێك لـەولاوە. دەبـینی لەگەڵ ئەوەی بەدرێـژای سـاڵ خوێندویـەتی و هـەوڵی داوە، بـەڵام لـەکاتی نزیکبونەوەی تاقیکردنەوەدا هەوڵەکانی زیاتر و چڕتر دەکات. باشە کەواتە

مرۆڤێك كە نازانێت كاتی مردنی كەیە! نابێت بە درێژایی تەمەنی ئامادەی لێپرسینەوە بێت؟!

## مردن نەبوونیەك نیە

ئـەو تـرس و لـەرز و خۆدورخسـتنەوەیەی مرۆڤـەكان لـەمردن لەنەزانینیانـەوە دێت بەرامبـەر بـە گرنگـی و ڕاستیەكانی مـردن. لەگـەڵ ئەوەدا مردن نەبوون نیە، ناوگۆڕ وەك ڕاڕەوێك وایە كە دەچێتە سەر ڕۆژی دوایی، مردن كۆتایی بوون بەخۆڵ و جیابوونەوەیەكی یەكجاری نیە، بەڵكو مردن جێگەیەكە بۆ بینینـەوەی دۆستان لەخۆشبەختیەكی هەمیشـەیدا.

پرسیارێكی ترم لەمامۆستای بەڕێزم كرد:

– كاتێك مەبەست و ئامانجی دروستبوونی مـرۆڤ و ئـەوەی كـە ڕۆژێك دێت لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكرێت، بەم جۆرە ڕوون و ئاشكرایە، مرۆڤـەكان بۆچی هێشتاش ئەرك و بەندایەتیـەكانیان ڕاست و بـەپێی پێویست ناگرنـە بەر؟

– ئەمە چەند هۆكارێكی گرنگی هەیە:

یەكەم: لەبەرئەوەی پیـاوە ئـاینی و بـانگخوازە ئیسلامییەكان نابنـە نموونەو بەشێوەیەكی جـوان ڕاستیەكانی ئیمـان ڕوون ناكەنـەوە، یـاخود نابێتە یارمەتیەك بۆ كاروبارەكانیان.

دووەم: مرۆڤەكان بەردەوام ڕاهاتنیان لەگەڵ كەیف و خۆشـییە كـاتی و بـێ سـوودەكان و، ئـەو كارانـەی نەفسـیان پێـی خۆشـە وەیـان فیكـری مانەوەی هەمیشەییان، بەم شێوەیە مرۆڤەكان لەژێر ئەم تەڵقینانەدا ئـەرك و بەندایەتیەكانیان بیردەچێتەوە.

سێیەم: ماددەو دەوڵەمەندی و دەسەڵات بەردەوام باس دەکرێت و ماناو جوانیەکانی باوەڕو ڕۆح لەبیر دەکەن یاخود لەبەرچاو ناگرن. بەڵام ئەزموونە بینراوەکان، بەشێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا ئەوە نیشان دەدەن کە مادەو پارە مرۆڤەکان دڵخۆش ناکەن، بەتایبەت دەبینین گەنجی کۆمەڵگە دەوڵەمەندەکان دەکەونە بارێکی دەروونی ڕووخاوو دڵتەنگیەکی زۆرەوە. بۆیە هەواڵەکانی ڕۆژانە نیشان دەدەن کە چۆن پێویستییان بە گەڕانەوە و پێویستیان بەئیمانو باوەڕ هەیە.

لەبەرئەمەیە کە دەبینرێت لەهەموو کۆمەڵگەکانی دنیادا گەڕانەوە بۆ دین زیادی کردوە، ڕووداوەکان ئەمە نیشان دەدەن، چونکە ناکرێت بەجۆرێکی تر جگە لە دین مرۆڤەکان دڵخۆش ببن.

واتە وەك ئەوەی بەدیعوزەمان دەفەرمووێت: "ئومێدەوار بن، لەئاخیر زەماندا بەهێزترین دەنگ دەنگی قورئان دەبێت"، ئەمە ئەو حەقیقەتەیە کە ئەو فەرموویەتی.

چەندین پرسیاری تریشم لەمامۆستا توران کرد، بەم شێوەیە قسە قسەی دەهێناو، گفتوگۆیەکی زۆر بەسودمان بردە سەر تاکاتێکی درەنگ. بەجۆرێکی تر بڵێم ئەوانەی مامۆستا توران لەکتێبی پەیامەکانی نوور بۆ ئێمەی لێکدەدایەوەو باسی دەکردن بەتەواوی وەك میوانداریەکی ڕۆحی وابوو. زۆر ئاسودە بوو بووین، ڕۆحمان پڕ بوو لەئارامی. لەمەوە تێگەیشتم کە وەك چۆن کاتێك گەدە برسی دەبێت خواردن وزەی بۆ دەگێڕێنێتەوە، خۆراکی ڕۆحیش ئیمانە، ئەگەر ئەم گفتوگۆ جوانانەو بەندایەتی و ڕووکردنە خوا نەبێت، ئەو کاتە ڕۆحیش برسی دەمێنێتەوە.

لەبەرئەوەشـە کـە بـاری دەروونـی تێکدەچـێتو مـرۆڤ بـەرەو بێـزاری و دڵتەنگی دەچێت.

## ئەو شەوە شەوێکی زۆر جیاواز بوو

ئەو شەوە لەگەڵ بیرکردنەوەم لەم شتە جوانانە، لای دایکم و ئـەوان خەوتم، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەس پەرۆشی من نەبوو. ئەو شەوە هەمووان لەگەڵ گوێگرتن و لێکدانـەوەو بیرکردنـەوە لـەم شـتە جوانانـەدا ئەوپـەڕی کـەیفو خۆشـیمان بـینی. کاتێـك مـرۆڤ نرخـی خـۆی دەزانێـت و، خـۆی دەناسێت، دەزانێت بۆچی دەژی و ئـەرکی بەندایـەتی چییەو لـەم بابەتـە جوانانـــەدا گفتوگـــۆ دەکـــات، هـــەم ئـــازارو ناڕەحەتییـــەکانی ڕۆحـــی دەسرِدرێتەوە، هەم زیاتر لەخودا نزیك دەبێتەوەو دەگاتە ئەو ئاسودەیی‌و ئارامییـە بـێ کۆتاییـە. ئـەو شـەوە هـەموومان ئـەو هەسـتە مەعنەوییـە جوانەمان چەشت، بەڵام خوشکەکەم لەهەموو ئەمانە بێ ئاگـابوو، لەسـەر بەرماڵەکەی خـۆی لـەموناجاتو پاڕانـەوەکانی بـەردەوام بـوو. هەرچـەندە ڕوون بوو کە ئـەو لـە دنیایـەکی ئاسـودەو ئارامـدا دەژیـا کـە بەخششـێکی خوای گەورە بوو بۆ ڕزگاربوونی ڕۆحی، بـەڵام تەمـەنی لاوی بەسەرچـووی ئەوو ئازاری کەوتنە بەردەسـتی بازرگانـانی مـرۆڤ بـەهیچ جۆرێـك نـەدەکرا لەمێشـکمدا بیسـڕمەوەو لـەبیری خـۆمی بەمـەوە، ئـەوەی کـە ڕقوکینـەو پێداگری منی هێواش دەکردەوە هەمیشە چاوەڕێ بـووم و بـەوە دڵخۆشـی خـــۆمم دەدایـــەوە کـــە لـــە حضـــوری خـــوادا بەرامبـــەر ئـــەو کەســـانە دەوەسـتمەوەو، ئەگـەرنا لەبەڵایـەکی لـەو جـۆرەدا مـرۆڤ چـۆن دڵخـۆش دەبێت؟ چۆن دەتوانێت دان بەخۆیدا بگرێت و ئاسودە بێت؟

## ئاه خوشكم ئاه...!

ئاه.. خوشكم... ئاه.. تۆ چەندە كەسێكی چالاك و بزێو بوویت و حەزت لە خۆشیەكانی ژیان دەكرد. چەند جوانو پاكو باش نیەت بوویت. چەندە بەتێڕوانینە پاكەكانی خۆت سەیری خەڵكت دەكرد، هەستت بەو بەلایانە نەكرد. كە هەموو ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێكانت دەچوویتە خۆشی و پیاسەكردن، چەندە من و دایكم دەمانویست ڕێگەت پێ بگرین، پێمان دەوتیت كە ئەم ژیانە بێ هودەییەت بەلات بەسەردا دەهێنێت. دەترساین ئەو تاقمە بێ بەزەییو دڵ ڕەقانە فێڵێكت لێ بكەن. دایكم هەموو كات باسی خوڕەوشتو دینو ئیمانی بۆ دەكردیت. زۆر هەوڵی دا بۆ ئەوەی ڕێگە بەڕەفتارە بێ سەرەوبەرەكانت بگرێت. بەڵام هەمیشە بەم قسانە خۆت دەپەڕاندەوە:

– خۆتان لە ژیانی من هەڵمەقورتێنن، من دەمەوێت ژیانی خۆم بژیم، من لە تەمەنێكدام كە بتوانم بڕیاری خۆم بدەم و سەربەستم، پێویستم بەهیچ كەس نیە بۆ دۆزینەوەی ڕاستیەكان، من دەمەوێ گەنجێتیم بەو جۆرەی حەزی پێ دەكەم بژیم، ناتوانم لەم تەمەنەمدا خۆم داپۆشم و نوێژ بكەمو هەموو شتێك لەخۆم قەدەغە بكەم؟! با جارێ كەیف لەم گەنجییەم ببینم، دوایی ئەوانەش دەكەم، هاوڕێكانم نیەتیان باشە، بەو جۆرە نین كە ئێوە لێیان دەڕوانن، من دەزانم خۆم بەڕێوە بەرم. ئاه... خوشكەكەم... ئاه.. تۆ بویتە قوربانی ئەو گەنجێتیە پاكو بێگەردەت.

بەڵێ ئەو شەوە شەوێكی زۆر جیاواز بوو، كاریگەریە دەروونیەكانی ئەو شەوە زۆر جیاواز بوو. كاریگەریەكانی ئەو شەوە تا ئێستاش لەسەر دڵو ڕۆحم هەست پێدەكەم. هۆكاری جیاوازی ئەو شەوەش بێ ئاگابوونم

بوو لەو شتانەی کە ڕوویـان دەدا، وەك ئـەوەی ئـەو شـەوە ئامادەکاریـەك بێـت بـۆ ڕووداوەکـانی داهـاتوو. وەك ئـەوەی ئـەو شـەوە پـاك بوونـەوە و ماڵئاواییەکی ڕۆحی بوو بێت، دڵەکان بەجۆرێکی تر لێیان دەدا و چاوەکان بەجۆرێکی تر دەیان بینی.



# بەشی چواردەیەم

## دایکم و خوشکەکەم....
## دەست لەناو دەست گیانیان دەسپارد

### پوختەی ئەم بەشە:

دایکم و خوشکەکەم.. ئیتر ماڵئاواییان دەکرد.. دەست لەناو دەست... دڵ وابەستەی یەك .. دایك و کچ پێکەوە. چی دەبێت منیش بەرن، توخوا منیش لەم دنیا پیسە بەتەنها جێ مەهێڵن ئاه لەکاتی گیان لەدەستدان... ئاه. خودایە چی دەبێت... یارەبی مەرگێکی لەو جۆرە بەنسیبی منیش بکە.

## ساتە لەبیرنەچووەکان

لەکاتێکی درەنگ وەختی شەودا بەقسەکردنێك بەئاگا هاتم، کاتێك چوومە ژوورەکەی دایکم و خوشکەکەم لەگەڵ دیمەنێکی زۆر سەیردا ڕووبەڕوو بووم. لەو ژوورەی دایکمو خوشکەکەم لێی دەخەوتن سێ کەسی لێ بوو، دایکم و خوشکەکەم و ئەو خانمە.. بەڵێ ئەو خانمە... ئەو خانمە.. ئەو خانمەی جاری پێشوو بینیم.. ئەو خانمە جوانو ئەفسوناوییو نەبینراو و پرشنگدارەی دنیا. خانمێك دەبینرا کە مرۆڤی دەحەپەساند، هەموو شتێکی بەرەو خۆی ڕادەکێشا، دیمەنێك باوەڕی پێ نەدەکراو باسی نەدەکرا. بەڵێ... لەبەرامبەر ئەو دیمەنە سەیرەدا زۆر پەشۆکام. ئەم سێ خانمە دیارە جارجار بەم جۆرە یەك دەبینن، دیارە دایکم هەموو شتێك بۆ من باس ناکات. بە تێپەڕبوونی کات دایکم وردە وردە قاچ و دەستی لەم دنیایە هەڵدەگرێت، لەگەڵ تێپەڕبوونی کات دایکی فریشتەم خەریکە دەبێتە فریشتە، خوشکەکەم و دایکم ئیتر دەچنە دنیای ئەو خانمەوە، بەڵام من ئەو دنیایە نازانم، تەنها لەدوورەوە بەلەرزین و حەپەساوییەوە تەماشایان دەکەم. هەناسەمم گرت.. تەماشانی ئاوێتەبوونو گفتوگۆکردنو ئەو حاڵە ئەفسوناویەی ئەو سێ خانمەم دەکرد. هەموو دنیاو سەرنج و هەستەکانم لێرەدا گرێدا. ئەو خانمە نەناسراوە قسە دەکاتو دایکمو خوشکەکەشم بەزەردەخەنەوەو ئارامییەوە گوێی بۆ دەگرن.. دەبێت چی باس بکات؟ دەبێت چ زانیاری و مزدەیەکیان پێ بدات؟ دەبێت چ هەواڵێکی لەو دنیا نەزانراوەوە هێنابێت؟ چەندە پەرۆش بووم، چەندە دەمویست بزانم.. ناتوانم باسی بکەم. زۆر دەمویست خۆم بخەمە ژوورەوە. زۆر دەمویست بڵێم "بۆچی

منـیش بێبـەش دەکـەن، بـۆ منیشـی بـاس بکـەن، منـیش بخەنـە نـاو وانەکانتانــەوە"، بــەڵام نەمدەویســت ئــەو دانیشــتنەیان لێ تێکبــدەم.. نەمدەیوست زیان بگەیەنم بەو ئاوێتەبوونەی ئەوان.

تەواو حەپەسابووم. گەورەترین سەرسوڕمانم ئـەوە بـوو، دەمبـینی، خوشـکەکەم پەیوەنـدی بـەدنیاوە بچـڕاندووە دایکمـی لـەباوەش گرتـووەو ماچـی دەکـاتو بـۆنی دەکـات. دایـکو کـچ لـەدوای ئـەو هـەموو ئـازارو فرمێسکانە بەتەواوی لەمیوانداریەکی ڕۆحیـدان. لەئاسـودەیی‌و ئارامیـدان. ئـەی مـن؟ ئـەی بۆچـی مـن لەبیردەکـەن؟ بۆچـی مـن دەردەکـەن؟ بۆچـی منیش نابەنە لای خۆتان؟ ئێوە کە ئاگـاداری هـەموو شـتێکن بۆچـی دەرك بە من ناکەن؟!

## فرمێسکەکانم بووبوون بە لافاو

لەخودا دەپاڕامەوە و، فرمێسـکەکانم بـوو بـوون بـە لافـاو.. لـەهۆش خـۆش دەچـووم، نەمدەویسـت ئـەم کـەش‌و هـەوا ڕۆحانیـە کۆتـایی بێـت. ئارەزووم نەدەکرد بگەڕێمەوە ناو پیسیەکانی دنیا. دەمویســت بەدرێـژایی ژیانم لەم حاڵەمـدا بـەردەوام بم. تەنانـەت لـەم ژینگـە ڕۆحانیـە جوانەشـدا ترسی دووبارە گەڕانەوەم بۆ ئەو ژیانە بێزارکـەرە بـەردەوام دەیسـوتاندم. دایکم هەستی پێ کردم. زەردەخەنەیـەکی شـیرینی بـۆ کـردم وەك ئـەوەی بیەوێت بڵێت:

– ئاگادار بە جوڵەیەك نەکەیت، ئەم ساتەمان لێ تێکبدەیت، بەحاڵێکی بێئاگاییەوە گەڕامەوە ناو جێگەکەم. وەك بڵێی خۆمم ون کردبوو. مـن لـە کوێم؟ لەم سەدەیەدا کام ساڵ، کام کاتـژمێر؟.. مـن کـێم؟ مانـای هـەموو ئەم شتانە چین؟ نایزانم.. نایدۆزمەوە.. مێشکم وەك دنیای نـەزانراوەکان،

وەك مەیدانی جەنگی لێهاتبوو، هەزارەها پرسیاری شیکار نەکراو.. هەزارەها مەتەڵ کە نەمدەتوانی لێیان بێمەدەر. نازانم چەندە سەرقاڵی ئەم دنیا تێکەڵو پێکەڵەم بووم، کە بە هەنسکی پڕ ئازاری دایکم هاتمەوە خۆم:

– سەلیم..سەلیم..

بانگی کردم. یەکسەر هەستام لەجێگەکەم، ڕۆشتمە ژوورەکەی دایکمو خوشکەکەم کە بینیم خوشکەکەم لەسەر (قەرەوێڵەکە) پاڵکەوتووە دایکم بەپەشۆکاوی لە پشت سەریەوەیەو ئەو خانمەشی لێ نیە. دایکم ئەو ڕووخسارو نیگا پڕ ئازارو خەماوی و پڕ لەنهێنیانەی بەرەو ڕووی من وەرگێڕا و وتی:

– کوڕم.. خوشکەکەت لەسەر ڕێیە، دەیەوێت ماڵئاواییمان لێ بکات. با بەڕێی بکەین.. وەرە لێرە دابنیشە.

## لەگەڵ خوشکەکەم یەکمان لەئامێزگرت

خوشکەکەم بۆ یەکەمجار نیگا نازیندوو بێ ڕۆحەکانی خستە سەر من، ڕێك ئاڕاستەی چاوەکانی منی کرد، تا بڵێی شیرینتر دەبوو. وەك بڵێی چەند ساڵ پێشتر منی ون کردبێت و ئێستا دۆزیمیەتیەوە. بەو هەستە گەورەیەوە بۆ لەباوەش گرتنم جوڵەیەکی کردو بەدەنگێك کە بیرم دەکرد، پەرۆشی بووم، ناخمی دەکردەوە، هەموو هەستەکانمی زیندوو دەکردەوە وتی:

– سەلیم...

– خوشکم...(لێی نزیك بوومەوە).

تۆ گەڕایتەوە ها؟ یاڕەبی ئەمە چ جوانیەکە؟ ئەمە چ نیعمەتێکی شیرینە؟.. تۆ خوشکەکەمت لەگەڵ ئێمە ئاشت کردەوە.. تۆ دووبارە خوشکەکەمت بە ئێمە بەخشیەوە.. خودایە شوکرو سوپاس بۆ تۆ..! خوشك و برا لەناو ئامێزی یەکدا دەگریاین لەحەسرەتدا بووین، فرمێسکەکانمان تێکەڵ بوو بوون. ئازارەکانمان گۆڕا بەخۆشەویستییەکی شیرین.. ئەو غەمەی ناخمانی دەسوتاند تەواو بوو. دایکم ئێمەی لەیەك جیاکردەوە...

وەك بڵێی خۆم لەدەست دابوو. هاوارم دەکرد:

– خوشکەکەم.. بەجێمان مەهێڵە، ئێمەش لەگەڵ خۆت بەرە، تۆ بوویتە هاوڕێی فریشتەکان، ئەو ئازارانەی تۆ چەشتت ئەوەندە قورس بوون، میهرەبانی و ڕەحمەتی خودایان بۆ هێنای. إن شاء الله ئاخیرەتی تۆیان ڕزگار کردووە، هیممەت بەئێمەش بدەو یارمەتیمان بدە، جێمان مەهێڵە.. لێت بێزار نابم، لێت تێر نابم، من بێ تۆ ناژیم. تۆ پارچەیەکیت لە ڕۆحم. تۆ گیانو ژیانی منیت. تۆ گەورەترین هاوڕێو هاوڕازی من بوویت. چی دەبێت بەجێم نەهێڵی. لەو کاتەی شەودا دایكو کوڕو کچ باوەشمان کردبوو بەیەکدا بووبووینە یەك گیانو یەك ڕۆح، دەگریاین، فرمێسکەکانمان بێزاربوو بوون، چەند بەرامبەری ئەو ئازارانەی ناخمان، ئەو ئاگرەی دەیسوتاندین سەرمان نابوو بەسەری یەکترەوە بۆ تۆڵەکردنەوە لەو ئازارانەی چەشتبوومان. دڵ و دەروونمان خستبووە سەریەك. خوشکەکەم بەدەنگێکی شیرین و ئەفسوناویەوە کە بەناڕەحەت دەبیسترا وتی:

- سەلیم ...گەردنم ئازاد بکە... زۆر ئازاری تۆو دایکمم داوە گوێم لێ نەدەگرتن، کەوتمە ناو خەیاڵەکانی گەنجیەوە، وامزانی بەو جۆرە خۆشبەخت دەبم، نەمدەزانی کە دڵخۆشی و ئاسودەیی ڕاستەقینە لەئیمانو چوارچێوەی حەڵاڵ دایە. بازنەی حەرام دڵخۆشی و ئارامی بەمرۆڤ نادات، تەنها خۆشییەکی خەیاڵییەو، بە ڕواڵەت لاشە لەناو کەیفو خۆشیدایە، بەڵام ڕۆح زۆر ئازاری قوڵ دەچێژێت لەناو ئەو ڕێگە پیسو حەرامانەدا، بێزاری و ناڕەحەتی زۆر هەست پێ دەکات.

## پەیامەکانی نووری لەبەر دەخوێند..

له ڕاستیدا "لەزەتی ڕاستەقینەو بێ ئازار، تەنها لە ئیمانو لەگەڵ ئیماندایە.. هەموو ئازارە ڕاستەقینەکان لەسەر ڕێگای حەرامو هەموو لەزەتەکانیش لەئیماندایە)"، ئێمە درەنگ هەستمان پێ کرد کە "ئیمان لەدنیاشدا لەزەتو چێژی بەهەشتێکی ڕاستەقینەیە و، ڕێگای حەرامش ناڕەحەتیو سزایەکی جەهەنەمییە"، مەگەر "ئیمان هەم نوور، هەم هێز نییە: ئیمان مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ. کفریش مرۆڤ دەکاتە دڕندەیەکی لاواز".

"ئەگەر ئیمان نەبێت یاخود ئیمان کاریگەری لەسەر گوێڕایەڵی مرۆڤ نەبێت، ژیان، لەگەڵ کەیفو چێژێکی کەم و ڕووکەشدا بەرامبەر هەزاران ئەوەندەی ئەو کەیفو خۆشیە، ئازارو خەم دەبەخشێت".

"ئیمان مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ جەوهەری بەهەشت، کفریش دڵو ڕۆح خامۆش دەکات، لە ناو تاریکیدا دەیهێڵێتەوە".

خوشکەکەم دیسان لە ناو دنیای خۆیدا ڕۆچوبووەوەو وتەو بەشە جوانەکانی (پەیامی نوور)ی یەك لەدوای یەك دەوت.

ئـای خودایـە...ئەمانـە چ ڕووداوگـەلی پـڕ نهێنـیو پـڕ پەنـدبوون. لەکاتێکدا خوشکەکەم "پەیامەکانی نوور"ی نەخوێندبووەوە، یان ئێمـە وا هەستمان دەکرد. کەوایە خوشکەکەم کە پەیوەندی لەگەڵ دنیا پچڕاوبوو و لـەدنیای خۆیـدا بـوو وانـەی لـەکێ وەردەگـرت؟ خوێنـدکاری کـێ بـوو؟ بەنووری کێ بەرەکەتدار بوو؟  کاتێك خوشـکەکەم لـە دنیـای خۆیـدا بـوو لەبەر خۆیەوە ئـەم ڕاستیانەی ئیمـانی دەوت، مـن و دایکیشـم بـە سـەرنج دانو بیکردنەوەیەکی گەورەو پڕ پەندەوە تەماشامان دەکـرد. سـات دوای سات لەگەڵ دایکم هەوڵمان دەدا مانای ئەم نهێنیانە شی بکەینـەوە، بـەڵام زۆر بـاش ئـەوەم دەزانـی کـە دایکـم دەرکـی بـە زۆر شـت دەکـرد، بـەڵام لەبەرئەوەی  وا بیری دەکردەوە کە من پێم هـەڵناگیرێت و بەرگـەی نـاگرم پێـی نـەدەوتم بـەڵام هـەموو ئـەم ڕووداوە نهێنیانـەم لـە دایکـم دەپرسـیو دەمویست بیزانم و فێربیم، مێشکم هێشتا وابەستەی ئەو خانمە مابووەوە، بەدایکم وت:

– دایکە.. تۆ دەزانیت، ئەو خانمە کێیـە؟ تکایـە بـەمنیش بڵـێ. دایکـم بەزەردەخەنەیەکی پڕ ماناوە سەیری کردم و وتی:

– کوڕم، بەندەکانی خوا تەنها بینراوەکان نین ئەو خانمەی کە بینیوتـە هاوڕێی خوشکەکەتە.

– باشە ئەوە کێیە ؟

دایکم ناچار کرد تا وتی:

– ئەوە حافـظ (قورئـانی لەبـەرە) فاطمـە خـانـە کـە لـە بوومەلـەرزەی گۆلبموکدا شەهید بوو.

– بەڵام ئەو دەژی؟!

- بەڵێ، تۆش دەزانیت کە شەهیدەکان نامردن، یارمەتی بەندە پەرێشانو ڕووخاوەکان دەدەن، فاطمە خانیش نێردراوە کە ببێت بە هاوڕێی خوشکەکەت.

## لە ساتەوەختی سەرە مەرگدا خوشکەکەم ڕاچڵەکی

خوشکەکەم لە ناو جێگەکەیدا ڕاکشابوو لەناکاو ڕاست بووەوە، نیگایەکی زۆر خاوێنی لە من و دایکم کرد، وەك بڵێی ئەمە ماڵئاوایی بوو، ئەم کۆتا سەیرکردنەی مانای جیابوونەوەو خەمی هەڵدەگرت. ڕێك بەمن و دایکم کە لە بەردەمی دانیشتبووین وتی:

- دووركەونەوە، ئیتر هاتن...

هەردووکمان یەکسەر سەیری دەرگاکەمان کرد، هیچ شتێك نەبوو، بەڵام دایکم وەك ئەوەی میوانی زۆر بەڕێز و گەورەی دیبێت خێرا هەستایە سەرپێو چووە بەردەمیان، من کەدرکم بەهیچ نەدەکرد، دەمویست بەتەواوی لە هەموو ئەو شتانە تێبگەم کە ڕوویان دەدا. خوشکەکەم وەك بیەوێت لەبەرامبەر ئەو میوانە هاتووەدا هەستێت و ڕێك ڕاوەستێت جوڵەیەکی کرد، بەڵام نەیتوانی هەستێت، دایکیشم بەتەواوی هەستایە سەر پێ، بەخشوعو هەناسەبڕکێوە وەستابوو سەیری دەکرد. دیاربوو کە ژوورەکە پڕ بوو لە مرۆڤی زۆر گەورە و گرنگ و هەروەها ئیزرائیل.

ئەو هەستە سەیرو پڕمانایەی لە ڕووخساری خوشکەکەمدا هەبوو، زەردەخەنەکانی سەر لێوی. بینینەکانی بەنرخ بوون، وەك ئەوەی مژدەیەکی گەورەی بیستبێت، ئاسودەیی‌و ئارامییەکان وردە وردە لەڕووخساریدا دەبینران. بەبێ وەستان هێواش هێواش لێوەکانی دەجولاند، ئاشکرابوو کە شەهادەتی دەهێناو خۆی بۆ خودا

ئاراستەکردبوو لەساتێکدا سەیری دایکم کرد، ئەویش لەو دنیا نەزانراوەدا لە هۆش خۆی چوو بوو، بەردەوام بوو لەسەر نزاو نیاز خوێندنەکانی.
خوشکەکەم لەناکاو ڕێك لەسەر ئەژنۆی وەستاو لەبەر خۆیەوە وتی:
– دایکە تۆشیان دەوێت..
دایکم ئەم دەنگەی بیست بوو یان نا خوشکەکەم یەکسەر چووە تەنیشتی. دوو ڕۆح، دوو دڵ، دوو ناخو دەروون، وەك بلێی بوو بوون بەیەك. دەستیان خستبووە ناو دەستی یەك و لەهەمان کەش و هەوای ڕۆحیدا خۆیان ئامادەی ڕۆیشتن دەکرد. منێکیش کە بەسەرسوڕمانەوە سەیری ڕووداوەکانم دەکرد، لەبەرئەوەی ڕووی ڕاستەقینەی ئەمانەم نەدەبینی بەتەواوی تووشی شۆك بوو بووم. خوشکەکەم بەدایکمی وت:
– موناجات بخوێنین، جەوشەن بخوێنین. "موناجات و جەوشەن، دوو پاڕانەوەی کاریگەر بوون، زۆر پڕپەندو ئاراستەکراو بوو". لەو کاتەدا کە ئەوان بەخۆشیو سرورەوە بەردەوام بوون لێوەکانیان دەجولاند، منیش لە ون بوون و سەرسوڕمانی خۆمدا دەمویست خۆم کۆبکەمەوەو هەوڵم ئەدا مانا ببەخشم بەوانەی لەبەرچاومدا دەگوزەرا. کۆتا وشە کە لە زاری خوشکەکەمەوە بیستم ئەمە بوو:
– لە لای تۆوە هاتین، بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە. ئێمە قبوڵ بکە، شەرمەزارمان مەکە لای خۆت. لە گوناهەکانم خۆش بە.

## ئەمە چ دیمەنێکی پڕ پەند بوو

خودایە ئەوە چ دیمەن و نمایشێکی پڕ پەندبوو، ئەوە چ ماڵئاواییەك بوو لەدنیا؟ ئەوە چ گیان دان و ڕۆح تەسلیم کردنێك بوو. دایکم و خوشکەکەم بەتەواوی مانا هەردووکیان پێکەوە لەناو باوەشی یەك، لە هەناسەکانی کۆتاییاندان. کۆتا ڕستەی هەناسەکانی دایکیشیم ئەمە بوو:

— بەڕێزم ئێمە دێین...دەستمان بگرە.

بەڕێزم... کام بەڕێزە؟

پێغەمبەر بوو ﷺ؟ یان زاتێکی موبارەکی تر بوو؟ کێ بوو ئەو بەڕێزە دیار بوو کە کێ بوو.. ڕوونترین و دیارترین شت جوانی و دەوڵەمەندی ڕۆشتن بوو بەئیمانەوە. دایك و کچ لای یەکەوە ڕاکشان. من لە ناو هاوار و گریانمدا ون بووبووم.

— بۆ منیشتان نەبرد؟ بۆ منتان جێهێشت؟ بۆ منتان لەبیرکردو لێرە بەتەنها بەجێتان هێشتم؟... هاوارم دەکردو فرمێسکم دەڕشت.

ئەو تابلۆ سەرسوڕهێنەرەی بەردەمم، هەموو هەستەکانمی سەرەوژوور کردبوو. پەرێشان و پەشۆکاو بووم لەبەردەم ئەو حیکمەتە بچووك و جوانانەدا. بۆ من لەم تابلۆ جوانەدا جێم نییە.. بۆ ئەو میوانانەی هاتنە ژوورەکەوە من نەمبینین... بۆ منیش لەگەڵ ئەم دوو مرۆڤە نەبووم کە دەست لەناو دەست و دڵ لەگەڵ دڵ بەرەو بەهەشت فڕین؟ دیار بوو.. تاقیکردنەوەی من هێشتا کۆتایی نەهاتبوو. بۆ گەیشتن بەم جوانیە هێشتا زۆر تاقیکردنەوەی تر ماوە کە دەبێت بیان بینم و بەشداریم تیایاندا. وەك چوارچێوەی فیلمێك ژیان و بەربەرەکانێ و ناڕەحەتیەکانی ئەم دوو مرۆڤەی بەردەمم بە بەردەوامی لەبەرچاومدا دەهاتن. ئەم ساتەوەختی مردنە، ئەم

وانەیەی فێرکردم: "ئیمان مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ، لەوانەشە بیکاتە سولّتان"، بەڵێ ئیتر ڕاستەقینە لێرەدا بوو، ڕاستەقینەی مردن لێرەدا بوو کە هیچ کەس ناتوانێت لێی ڕابکات و هەموو کەسێك دەبێت ڕۆژێك بیچێژێت.

ئێستا هەر مرۆڤێك، هەرکەس کە ئەقڵی هەبێت ناچارە کە خۆی بۆ ئەو (مردن)ە ئامادە بکات. هیچ جوانیەك و، دەوڵەمەندیەك هیچ ناوبانگێك و هیچ گەورەییەك نییە، وەك ڕۆیشتن بە ئیمانەوە.

## چۆن دەژیت و چۆن دەمریت

مرۆڤ چۆن و چ جۆرە ژیانێك بۆخۆی دیاری بکات ئاواش مردنێك و چۆنیەتی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاری دیاری دەبێت، چونکە ئەم ڕۆشتنە گەڕانەوەیەکی ترو قەرەبووکردنەوەیەك و شانسێکی دووبارەی بەدواوە نییە. کەمێك خۆم کۆکردەوەو هەواڵم گەیاندە مامۆستا توران، خودا لێیان ڕازی بێت خێرا هەموویان لەگەڵم هاتن. کاتێك خەندە هاتەژوورەکەوە، هاواری کرد:

– الله أکبر، ئەمە چ شیرینیەکە، چ جوانیەکە ئەمە چ نوورێکی گەورەیە..

بەڵێ ڕاست بوو ئەو جوانیە باس نەکراوەی ناو ئەو ژوورە بەهەموو لایەکدا پرشنگی دەدایەوە، هەموو شتێکی دەترساند، دانە دانەی ئەندامی خێزانەکەمم بەڕێ کرد بەرەو ئەو جیهانەی تر... ئەو مردنە جوانەی دوو هاوڕازەکەم، دوو هاوڕێ گیانی بەگیانیەکەی ژیانم، ماڵئاوایی کردنی ئەو دووانە پێکەوە، هەرگیز لە پێش چاوم لاناچێت... خودایە چ گیان کێشانێکی سەرسوڕهێنەر بوو؟!.. چ سڵاوکردنێك بوو لە مردن، لە ئەجەل و، لە فریشتەی ئیزرائیل؟!.. هێشتاش سەرم سوڕماوە، ئێستاش کە دێتەوە بیرم موچوڕکە بەگیانمدا دێت.

هـــەرگیز لـــەبیرم ناچـێت ســاتەوەختی گەشـــتی جـوانی دایکـم و خوشکەکەم بۆ جیهانی نەبڕاوە، خۆزگە ئەو دیمەنـەی کـە مرۆڤـی تووشـی سەرسوڕمان دەکرد دەمتوانی بەکامێرەیەك تۆماربکـەم، تـا (ڕاسـتەقینەی مەرگ)م نیشانی خەڵك بدایە. ئەوان وەکو فریشەتەکان فڕین بۆ ناو دنیـای پڕ لەجوانی و ئاسودەیی.. ئەوان ئەو تەمەنە پڕ لە ناڕەحەتی و ئازارەیـان بەجێ هێشتو گەیشتن بە ئارامی و دیداری مەولایان. ئێستا زۆرباش لـەوە تێدەگەم کە خاوەنی زۆرترین دارایی بین، مـاڵ و مـوڵکی زۆرمـان هـەبێت، بەهێزترین کەسی دنیابین، جوانترین بـین، پێگەیـەکمان هـەبێت کـە کـەس پێی نەگات، و بەدرێژایی تەمەنمان لەناو ناوبانگ و خۆشـیدا بـژین، ئەگـەر کۆتـا هەناســەمان بەئاسـودەییەکانی ئیمانــەوە نـەبێت ئــەوا تاریکیــەکی نەبڕاوەیــە، ســزایەکی بـێ کۆتــایی، ناڕەحــەتی و تیاچــوونێکی بــەئازار چاوەڕێمان دەکات.

## گەورەترین دەوڵەمەندی

ئەگـەر سـاتەوەختی بەجێهێشـتنی دونیـات بەئیمانـەوە بێـت، ئـەوا گـەورەترین دەوڵەمەنـدی و، گـەورەترین پێگـەو، گـەورەترین ناوبانگـت هەیـە.. چـونکە دەوڵەمەنـدی ڕاسـتەقینە لـەماڵ و مـوڵکی ٥٠–٦٠ سـاڵی تەمەندا نییە، بەڵکو لە ماڵ و موڵکی جیهـانی نەبڕاوەدایـە، مـاڵ و موڵـك و جوانیـەکانی بەهەشـتیش ئـەنجامی کـردەوەی بـاشو بەندایـەتی کردنـی خودایە. ئەوانەی کە هێشتا دوودڵن. ئەوانـەی کـە هێشـتا نایانـەوێت ئـەم ڕاستیە قبووڵ بکەن.. ئەوانەی کە هێشـتا "مـردن" نـابینن و بـۆ دنیایـەك دەگەڕێن کەمردنی تیانەبێت.. ئەوانـەی کـە دەیانـەوێت لـەم تاقیکردنـەوە

گەورەیە ڕابکەن، ئەوانەی کە هێشتا دەیانەوێت تەمەنیان بەکەیف و خۆشیو ڕێگەی حەرام خراپ بکەن. لەئێوە دەپرسم:

(ئایا دەتوانن مردن بمرێنن؟ دەتوانن گۆڕ لابەرن؟ دەتوانن پیربوون و نەخۆش کەوتن بوەستێنن؟!) نەخێر.. کەوایە پێویستە بەرلەوەی فریشتەی مەرگ لەکاتێکی هەرگیز چاوەڕوان نەکراودا بێتە لامان بیربکەینەوەو خۆمان ئامادەی لێپرسینەوە بکەین. و هەموو ڕۆژێك ئەم پرسیارە لەخۆمان بکەین: ئایا تا چەند ئامادەی مردنم؟!



# بەشی پازدەیەم

## کە چاوەکانم لەدەست دا

## بانو وازی لێ هێنام، خەندەش...

### پوختەی ئەم بەشە:

یەك بەیەکی دۆستە گیانیەکانم بەڕێ کرد، باوکم بەترس و لەرزەوەو، دایکم و خوشکەکەشم بە ئیرەیی پێ بردنەوە.. خودایە ئەمە چ تاقیکردنەوەیەك بوو؟! ئەی من؟

منیش چاوەکانم لەدەست دا، بەڵام مەولام دۆستێکی گیانی بۆ ناردم.

## چاوەکانم لەدەست دا..

دەزانم پەرۆشن بۆ زانینی بارودۆخی کۆتایی من، وەك بۆخۆتان دەبینن ئێستا چاوم نابینێ، بۆچی؟

دوای ئەوەی تاقە دۆستەکانم بۆ جێگای هەمیشەییان و، ئارامگای کۆتاییان ماڵئاواییان لێکردم، سواری ئۆتۆبیلەکەم بووم، ڕۆیشتم بۆ لێپرسینەوەی هاوسەرەکەم و خەزوورو خەسووم، چونکە ئەوەندە سازشیان نەنواندبوو کە بێن بۆ بەخاك سپاردنی دایکم و خوشکەکەم، بەڵام هێشتا نەگبەتیەکانم کۆتایی نەهاتبوو کە لەڕێگەدا تووشی کارەسات بوومو چاوەکانم لەدەست دا.

سەرەنجام؟!

زۆر غەمگینە .. زۆر بە ئازارە...

ئیتر نابینم ...دنیام گۆڕا بەزیندان. وەك ئەوەی لەجێگایەکی تاریکی داخراودا خنکاوم.. بەئازارتر لەمەش ئەوە بوو کاتێ کە چاوەکانم لەدەستدا هاوسەرەکەشم بەجێی هێشتم، لەبەرئەوەی ئیتر پیاوێکی بێ کەڵك بووم ، چۆن بڵێم ڕزگاری کردم.. بەڵام ئەوەی منی پەرێشان و غەمگین کردبوو، ئەوەبوو کە هاوسەرەکەم لەو بێ چارەییەمدا بەجێی هێشتم، ئەوەی منی دەکوشت و شەرمەزارو پەرێشانی دەکردم خاوەندارێتی کردنەکەی مامۆستا توران بوو بۆ من. ئەگەر دەپرسن ئێستا چی دەکەم:

لەگەڵ ئەو خەندەیەی کە بەخۆشەویستی و میهرەبانو سۆزداری خۆیەوە منی بەهاوڕێی هەمیشەیی ژیانی پەسەند کرد، شوکرو سوپاسگوزاری پەروەردگارمان دەکەین، گەورەترین دڵنەوایش بۆ من،

کتێب خوێندنەوەکانی خەندەیە بۆم، کە ڕووناکەرەوەی دنیای تاریکمە.
ئەگەر (پەیامەکانی نوور) نەبوایە، ئەگەر ڕاستیەکانی ئیمانمان نەناسیایە، ئەگەر باوەڕم لاوازبوایە، لەم بار قورسی و نارەحەتیە بەرگە نەگیراوانەدا تەنها هەڵبژاردنم خۆکوشتن دەبوو. ئێستاش بەبیرکردنەوە لەو جیهانە هەمیشەییەی کە دایکم و خوشکەکەم بۆی چوون، دەستەکانم بەرزدەکەمەوە بۆ لای میهرەبانی خوداو تۆبەو ئیستغفار دەکەم و بەم جۆرە ڕۆژەکانم دەگوزەرێنم.

مامۆستا ..

چی دەبێت... با چیرۆکی من هەموو کەس بیخوێنێتەوە. بیخوێننەوەو پەند وەربگرن.. نەکەونە ئەم هەڵانەوە. باوکەکان بیخوێننەوەو نەکەونە هەڵەکانی باوکمەوە. دایکەکان بیخوێننەوەو لە فیداکاریەکانی دایکمەوە پەند وەربگرن. خوشکەکان...هاوڕێیان بیخوێننەوەو هەڵەکانی خوشکەکەم هەڵنەبژێرن. گەنجە خوێن گەرمەکان بیخوێننەوەو وانە وەربگرن لە هەڵەکانی من.

## کۆتایی خەمناکی هاوسەرەکەم و خەزوورم

بەم جۆرە لێم پرسی:

- ئێستا هاوسەرو خەسوو خەزووری پێشووت لە کوێن و چی دەکەن؟

سیمای شیرینی سەلیم تێکەڵی ئازاربوو، ڕووخساری پڕبوو لە هێڵی پڕ ماناو پەند.

- خودا بەجۆرێك دادپەروەر و میهرەبانە، بەجۆرێك خاوەنی هێزو دەسەڵاتە، ئەوەندە بەسە ئێمە پشتی پێ ببەستین. ئارامگربین‌و خۆمان بدەینە دەست ئەوو چاوەڕێی سەرئەنجامەکان بکەین، ئەو ئاڵۆزترین

ڕووداوەکان بەجوانترین شێوە شی دەکاتەوە، حەق و مافی هیچ کەس لای هیچ کەسی تر ناهێڵێتەوە.

خەزوورم تووشی خوێن بەربوونی دەماغ بووە، ئێستا ئیفلیجەو کەوتووە لە جێدا. بەو هەواڵانەی بیستوومە ڕۆژ دەژمێرێت. لەم کۆتاییانەدا یەکێك لەبەردەستەکانی ناردووەتە لام "با سەلیم گەردنم ئازاد بکات".

– ئەی تۆ چیت وت؟

– پێم وت: من ئازادی دەکەم، بەڵام مەولام ئازادی دەکات نازانم؟! بەڵام ئەوەی کە دەیزانم ئەوەیە، ئەو پیاوەی باوەڕی وابوو هەموو شتێك بەپارە دەکڕدرێت و دەفرۆشرێت و، تەنانەت ئێمەی لەجێی مرۆڤیش دانەدەنا، لە ترسی ئێخە گرتنی مەرگ و لێپرسینەوەدایە.

هاوسەری پێشوشم لە بارودۆخێکی پڕ ناسۆرتردایە... ئێستاش بۆ ڕزگاربوونی زۆر دوعای بۆ دەکەم...

هێشتا بەردەوامە لە هەڵەکردن و تێکدانی ژیانی خۆی بەدەستەکانی خۆی... لەو دنیا تاریکەیدا بەجۆرێك لەسەری دەدرێت، کاتێك کە هۆشی بەخۆیدا هاتەوە تێدەگات بۆ هەموو شتێك زۆر درەنگە.. بەڵام إن شاء الله بەرلەوەی ئەو نەگبەتیانەی بەسەردا بێت دێتەوە بەخۆیداو ڕوودەکاتە خوای گەورە. گەردنی ئەویشم ئازاد کردووە، خوا چاکی بکات...

تەمەنی گەنجێتی کە ڕازێنرابوەوە بەئازار، هەنسکە هەڵکێشراوەکانی ناو ناخ و ڕوخساری گەنجێکی خوێن گەرم حاڵێکی بەسەرماندا هێنابوو، هەم ئێمەی دەگریاند هەم خۆیشی بەبێ وەستان فرمێسکی دەڕشت. بەسەرهاتی ئەم ژیانە باوەڕپێنەکراو و بەرگە نەگیراوە، وردە وردە ناخی

مرۆڤ دەسوتێنێت، تەنانەت گوێ گرتنیش بۆی ئەشکەنجەی مرۆڤ دەدات.. ئـەی ئەگـەر پێیـدا بگوزەرێـت؟ تەنانـەت خـەیاڵ کردنیشـی لەرزنێنـەرو ترسێنەرە.

## هاوسەرگیرییەکی درەنگ وەخت ..

خەندە خان بوو بووە دەست و چاو و قاچی سـەلیم، بەتـەواوی وەك فریشتە بوو بوو بە پەروانە بەدەوریدا. بەخششێکی خودا بـوو بـۆ سـەلیم. ئەوان بەهیچ جۆرێك لەژیانیان ناڕازی نەبوون ، تـەنها بـۆ وانـە وەرگـرتن و پەند لـێ وەرگـرتن نووسـینەوەی چیرۆکەکەیان پەسـەند کـرد. تـاکو ئـەم بەسەرهاتی ژیانە نەبێتە ڕیاکاری و خۆدەرخستن داوای گۆڕینی ناوەکانیان کرد. ئێمەش وامان کرد لە کۆتاییدا پرسیارێکم لە سەلیم کرد:

– باشە دوای بەڕەحمەت چوونی دایکـتو خوشـکەکەت، هـیچ کـات لـە خەونتدا نەتبینیون؟

سەرەتا سەلیم نەیدەویست باسی بکات، دوایی بەیارمەتی و هانـدانی خەنـدەخان دەسـتی بەگێڕانـەوەی کـرد، هـەم دەیگێڕایـەوە هـەم لـەو چاوانەیەوە کە هێزی بینینیان نەمابوو وەك باران ئەسرین دەهاتە خوار:

– زۆر بینیـومن هەنـدێکی بـاس ناکـەم، بـەڵام دەمـەوێت یـەکێکیان بگێڕمەوە.

لەخەونمـدا لەجێگەیـەك بـووین کـە نەمدەناسـیو نەمـدەزانی بـەو جۆرەی وامدەزانی ماڵمان لەوێ یە، پرسیاری ماڵی خۆمانم کرد، خەندەشم لەگەڵ بوو. گەیشتینە کەسێك پرسیاری ماڵی خۆمانم لێ کرد، وتی:

وەرن... من فریشتە خان دەناسم.

بەخۆشحاڵیەوە ڕۆیشیتن، دەشمزانی کە دایکم و خوشکم مردوون. لەخەوەکەمدا بۆماڵەکەمان دەگەڕام، وتی:

- بەڵێ...ئەمە کۆشك و تەلارەکەی فریشتە خانە.

زۆر سەرم سوڕما:

- ئای خودایە... ماڵی ئێمە خۆ دووژووری بچووك بوو. ئەم کۆشكو سەرایە لەکوێوە هات! ڕۆیشتینە ناوەوە، هەموولایەك پڕ بوون لەخەڵك بەڵام چۆن خەڵکێك، جلوبەرگییان پاك و سپی، خاوێن و بێگەردو بێ عەیب.

## بۆ دایکم دەگەڕام

لەناو کۆشکەکەدا بەزاتێکی تر گەیشتین وتی:

- بەدوای کێدا دەگەڕێن؟

وتم: دایکم ... واتە فریشتە خان

- فریشتە خان، بەڕاستت؟! -دیاربوو بەدڵنیاییەوە ئەوی دەناسی- فریشتە خان بەرپرسیاری ئێرەیە، وەرن ئێوە بەرمە لای لەدەرگایەکی گەورەوە چووینە ژوور، ڕاڕەوێکی سەرسوڕهێنەر، لەناکاو لەگەڵ دایکم ڕووبەڕووبووین، خوشکەکەشم لەتەنیشتی بوو، تا تێربووین یەکمان لەئامێز گرت، بۆنی میسکی لێ دەهات، ئەو بۆنە تایبەت بوو بەخۆی. تا توانیم بۆنیم کرد و، بۆ یەکەمجار خوشکەکەشم لەباوەش گرت، حاڵی وەك ئەو کاتەبوو کە هێشتا نەخۆش نەکەوتبوو. دایکم خەندەی بینی وتی:

- زۆر خۆشحاڵم کچم، زۆر خۆشحاڵم.. کە هەواڵەکەمان بیست لەگەڵ کچەکەم زۆر شکوری خوامان کرد. تۆ جوانترین بووکی کە شیاوی ماڵی ئێمە بیت. وتی:

– سەیرکە...ئەم ژوورەمان بۆ ئێوە جیاکردۆتەوە، تا ئەو کاتەی ئێوە دێن ئێرە بەکلیل لێدراوی دەیپارێزین. لەدایکم پرسی:

– دایکە.. ئێرە کوێیە؟ ئێرە کام شارەیە؟ ئێوە چۆن ئەم کۆشکو تەلارەتان کڕیوە؟

– کوڕم ئەم کۆشکە تایبەتە بەشەهیدەکان، ئێمەیان ناردە ئێرە، منیشیان بەخانمی ئەم کچانەی ئێرە هەڵبژارد، ئێمە نەمردوین، ئێمە شەهیدبووین. ئێمە هەموو ڕۆژێك دێینە میوانی ئێوە، بەڵام ئێوە قسە لەگەڵ ئێمە ناکەن. لێم پرسی:

– دایکە .. باوکم لێرە نییە؟

– هیچ هەواڵم لەوەوە پێنەگەیشتووە، پرسیم، بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە. زۆر لەخودا دەپاڕێمەوە بۆ ئەو.

دایکم دووبارە باوەشی کرد بەخەندەدا:

– کچم .. هەرگیز لە بیرت نەچێت! ئەوانەی بۆ خودا دەژین، ئەوانەی بەندەی ڕاستەقینەی خودان، ئەوانەی وانەی ئیمانو قورئان بەکەسانی تر دەگەیەنن ئەوانە دەبنە شەهیدی مەعنەوی. ئەگەریش شەهیدبن ئازاری مردن ناچێژن، لەگەڵ ئەوەشدا شەهیدەکان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ناکرێت.

لەبیرتان بێت! خۆشیەکانی قیامەت، بە بەندایەتی و چاکەکاریەکانی دنیا بەدەست دێت.

کە بەئاگاهاتم، دیم لەناو جێگادام. ئاه وتم... خۆزگە بۆ هەمیشە بەئاگا نەدەهاتمەوەو لەوێ دەمامەوە.

لەدوای هاتنە دەرەوەم لەخانووە سادەو پڕ لەئارامی و خۆشیەکەی سەلیم و خەندە، هێشتا نەهاتبوومەوە سەرخۆم.. وەك بلێی خۆم لەناو کاتدا ون کردبوو.

چیرۆکی سەلیم و فریشتە خان، ئەوەندە پڕ پەند بوو ئەوەندە پڕ وانەبوو، وەك بلێی ئەو ژیانەی ئەوان بەسەریان بردووە هەموو شتێك کورت و پوخت دەکاتەوەو ڕووی ڕاستەقینەی هەموو شتێك نیشان دەدات.

پوختەی ئەم کتێبەی کە لەگەڵ فرمێسك ڕشتندا گوێم بۆ گرتبوو، لەگەڵ فرمێسك ڕشتندا هەر وشەیەکم نووسیەوە لەم دوو خاڵەدا کۆدەکەمەوە:

- ئێمە لەکوێی بەندایەتیداین؟
- ئێمە تا چەند ئامادەی مردنین؟

هەرکەسێك بەر لەهەرکارێکی تر بابگەڕێتەوە دنیای خۆیو وەڵامی ئەم پرسیارانە بدۆزێتەوە، ئەگەر نا بەیانی ڕەنگە زۆر درەنگ بێت.

## پێڕست

# SELİM VE HANDE

## HALİT ERTUĞRUL

بەرهەمێکی تری خالید ئێرتوغروڵ ..

خالید ئێرتوغروڵ کە بە کتێبەکانی (ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت) و، (محمدی دوزجەیی) و (ئایسێل) دڵەکانی فەتح کرد و پێوانەی فرۆشتنی شکاند، ئەمجارەش واژۆ لەسەر بەرهەمێکی هەست هەژێنی تر دەکات.

بەسەرهاتی سەلیم و خێزانەکەی کە لە چینێکی دەوڵەمەندا دەژیان، ئالوودەبوونی باوکی بە قومارو ئافرەت، پاشان ڕووبەڕووبوونەوەی بە هەژاری چاوەکانتان شێدار دەکات.

خوشکەکەی، کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی خراپ و نەخۆش دەکەوێت، ونبوونی باوکی لەو باروودۆخەداو بەهێزی تەوەککولی دایکی لەناو ئەو بەلایانەدا و، دوودڵی "سەلیم" ی لاو لە نێوان هەڵبژاردنی " بانو" ئەو کچە دەوڵەمەندەی کە خۆشیدەویست ، هەروەها " خەندە"ی دینداردا، نوقمی سەرسامیتان دەکات.

بەکورتی وەك هەموو بەرهەمەکانی تری خالید ئێرتوغروڵ ئەم بەرهەمەش کە ناوی (سەلیم و خەندە)ی هەڵگرتوە دەتانهەژێنێت، خەمبارتان دەکات، دەتانگریێنێت، دڵخۆشتان دەکات و، دوا جاریش پێشنیازی خوێندنەوەی بۆ هەموو کەس دەکەن.

ISBN 128-000-000-7






ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ara.m@hotmail.com

نرخی (٣٠٠٠) دینارە